# ژن هێنان و شوو کردن
# حوکم و ئاداب و مەرجەکانی

ئامادەکردنی

محسن محمود سلێمان

پێش نوێژو ووتارخوێنی مزگەوتی
صەلاحەدین
زەڕایەن

چاپی یەکەم

١٤٤٠ ك ٢٠١٩ م

# خوای گەورە فەرمویەتی:

﴿ وَمِـــنْ آيَاتِـــهِ أَنْ خَلَــقَ لَكُــمْ مِــنْ أَنْفُسِـكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (٢١)﴾ سورەتی ڕووم.

# پێرست

# پێشەکی

**سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری بەرز و خاوەن شــکۆ و سەلات و سەلام بۆ سەر گیانی پاکی پەیامبەری ئیسلام و خانەوادە و هاوەڵان و شوێنکەوتوانی هەتا ڕۆژی دوایی.**

خۆشەویستان ئـەم کتێبـەی کـە لەبەردەسـتاندایە لـە بنەڕەتـدا چـەند وانەیەکی تۆمارکراو بـوو لەسـەر حـوکم وئادابـەکانی ژن هێنـان و شـوو کردن لەئیسلامدا دواتر لەلایەن برایەکی خۆشەویستەوە ـ خواپاداشـتی چاکەی بداتەوەـ هەسـتا بەنوسـینەوەی و پاشـان بـۆی ناردمـەوە بـۆ ئەوەی چاوێکی پیادا بخشـێنم پـێش ئـەوەی بـڵاو ببێتـەوە،منـیش بـە ووردی لەسەرەتاوە هـەتا کۆتـایی خوێندمـەوە و ئـەوەی پێویسـتی بـە دەستکاری کردبێت بە جوانتر دام ڕشتووەتەوە چونکە ئاشکرایە زمانی نوسین جیایە لە ووتار و وانەی دەنگی ،سوپاس بۆ خـوای پـەروەردگار ئێسـتا زۆربـەی حـوکم وئـاداب و مافـەکانی ژن و پیـاو و سـوننەتەکانی شەوی گواستنەوەی لە خۆ گرتووە،داواکـارم لـە خـوای گـەورە بیکاتـە هۆی چاو ڕۆشنی بـۆ هـەموو ژن ومێـرد و بـوك وزاوایـەك و بتـوانن ئـەم ڕێنومایيانــە جــێ بــەجێ بکــەن بــۆ ئــەوەی خێزانێکــی بەختــەوەر دروستبکەن و دووربـن لـە هـەموو ئـاژاوە و ناکۆکییـەك چـونکە بـەردی

**بناغەی هەموو کۆمەڵگەیەکی چاك لە خێزانێکـەوە دەسـت پـێ دەکـات ئەگەر خێزانـەکان چـاك و گونجـاوبن ئاشـکرایە کۆمەڵگـەکانیش چـاك و گونجاو دەبن هەر بۆیە پێویسـتە گرنگـی بـدرێت بـە پـەروەر دەکردنـی خێزانەکان.**

**محسن محمود سليمان**

**٢١/ ٤/ ١٤٣٩ ك**          **٨/ ١/ ٢٠١٨ ز**

# بەشی یەکەم

# پاداشتی ژن هێنان و شوو کردن لە ئیسلامدا

ئاشکرایە کە ژن هێنان و شوو کردن لە سوننەتی پێغەمبەرانە ـ صەلات و سەلامی خوایان لە سەر بێ ـ وە ك خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلاً مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجًا وَذُرِّيَّةً.... (٣٨)﴾ سورەتی رەعد.

واتە:بەڕاستی پێش تۆ پێغەمبەرانی ترمان ڕەوانە کردووە و هاوسەر و نەوەشمان پێ بەخشیون.

وە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامیشدا زیاتر تەئکیدی لێ کراوەتەوە وەك ئەنەس خوای لێ ڕازی بێ فەرمویەتی:((جَاءَ ثَلاَثَةُ رَهْطٍ إِلَى أَزْوَاجِ النَّبِىِّ -ﷺ- يَسْأَلُونَ عَنْ عِبَادَةِ النَّبِىِّ -ﷺ- فَلَمَّا أُخْبِرُوا بِهَا كَأَنَّهُمْ تَقَالُّوهَا فَقَالُوا : وَأَيْنَ نَحْنُ مِنَ النَّبِىِّ -ﷺ- وَقَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ فَقَالَ أَحَدُهُمْ : أَمَّا أَنَا فَأُصَلِّى اللَّيْلَ أَبَدًا وَقَالَ الآخَرُ : إِنِّى أَصُومُ الدَّهْرَ فَلاَ أُفْطِرُ وَقَالَ الآخَرُ : أَنَا أَعْتَزِلُ النِّسَاءَ وَلاَ أَتَزَوَّجُ أَبَدًا فَجَاءَ النَّبِىُّ -ﷺ-- إِلَيْهِمْ فَقَالَ :« أَنْتُمُ الَّذِينَ قُلْتُمْ كَذَا وَكَذَا أَمَا إِنِّى لأَخْشَاكُمْ لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ

وَأَتْقَاكُمْ لَهُ لَكِنِّى أَصُومُ وَأُفْطِرُ وَأُصَلِّى وَأَرْقُدُ وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِى فَلَيْسَ مِنِّى)) ئیمامی بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

واتە:جارێكیان كۆمەڵێك هاتنە لای ماڵی پێغەمبەر ﷺ و لە عیبادەت و بەندایەتی و خواناسی پێغەمبەرﷺیان پرسی ، كاتێك بۆیان باسكرا كە پێغەمبەر ﷺ شەو نوێژی وایە و ڕۆژوو گرتنی وایە و خاوەنی چەندین خێزان و ماڵ و منداڵە ـ ئەم بەندایەتییەی پێغەمبەریانﷺ بەكەم زانی و ووتیان خوای گەورە لە هەموو تاوانەكانی ئەو خۆش بووە و ئێمە ناگەین بەو ـ هەربۆیە یەكێكیان بڕیاری دا و ووتی: ئەوە من هەتاوەكو ماوم ژن ناهێنم و خۆم یەكلایی دەكەمەوە بۆ عیبادەت و بەندایەتی بۆ خوای پەروەردگار .

یەكێكی تریشیان ووتی: منیش هەموو شەوێك هەتا بەیانی شەو نوێژ دەكەم و خۆم سەرقاڵ دەكەم بەبەندایەتییەوە بۆ خوای گەورە .

ئەوی تریشیان ووتی: منیش هەتاوەكو لەژیاندا ماوم هەموو ڕۆژێك هەتا ئێوارە بەڕۆژوو دەبم و بەندایەتی دەكەم بۆ خوای پەروەردگار.

كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە بۆ ماڵەوە خێزانەكانی ئەمەیان بۆ گێڕایەوە و پاشان پێغەمبەر ﷺ ناردی بە شوێنیاندا و ئەوانیش هاتن و

پێی فەرموون: (أَنْتُمُ الَّذِينَ قُلْتُمْ كَذَا وَكَذَا) ئێوە بوون ئاوا و ئاواتان ووت؟ ووتیان: بەڵێ.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أَمَا إِنِّی لأَخْشَاكُمْ لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ) سوێند بە خوای پەروەردگار من لە هەمووتان زیاتر لە خوا دەترسم ، من لە هەمووتان زیاتر خەوف و بیمی خوای پەروەردگار لە دڵمدا هەیە بەڵام لە هەمان كاتدا ((أَصُومُ وَأُفْطِرُ)) دوازدە مانگەی ساڵ بەڕۆژوو نابم، هەندێك لە ڕۆژەكانی بەڕۆژوو دەبم و هەندێكی تری بەڕۆژوو نابم.

وەك ئاشكرایە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژانی دووشەممە و پێنج شەممە بەڕۆژوو دەبوو، وە ڕۆژانی سیازدە و چواردە و پازدەی مانگی سپی بەڕۆژوو دەبوو، وە هەروەها نۆمینەی حاجیان بە ڕۆژوو دەبوو، كەواتە: پێغەمبەر ﷺ هەموو ڕۆژەكان بەڕۆژوو نەدەبوو، لە پاشان فەرمووی: ((وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ)) وە شەویش تاوەكو بەیانی من شەونوێژ ناكەم بەڵكو هەندێك لە شەو دەخەوم وە هەندێكی تریشی بەندایەتی و خواناسی دەكەم بۆ خوای پەروەردگار ((وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ)) وە من خاوەنی خێزانیشم.

تەماشا بكەن ئـەم سـێ شـتەی کـە ئـەم پیاوانـە ووتیـان هەنـدێکیان تـا بەیانی شەو نوێـژ بکـەن و هەنـدێکیان بـە ڕۆژ تـا ئێـوارە بـەڕۆژوو بـن و هەندێکیان واز لە ژن و ماڵ و منداڵ بێـنن بـۆ ئـەوەی کـە بەندایـەتی بـۆ خـوای گـەورە بکـەن و سـەرقاڵ نـەبن بـەم شـتانەوە، پێغەمبـەر ﷺ ئاگـاداری کردنـەوە: مـن بـە پێچـەوانەی ئێـوەم بـەڵکو ڕۆژووش دەگـرم هەنـدێك ڕۆژیـش بـەڕۆژوونابم، شـەونوێژیش دەکـەم و دەشـخەوم، وە خاوەنی ماڵ و منداڵ و خێزانیشم ، لە پاشان پێغەمبەر ﷺ فـەرمووی: ((فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّى))ئەو کەسەی کە پشت بکاتە سـوننەت و ڕێبازی من ئەوە بێگومان لە من نیە.

لە فەرموودەیەکی تـردا پێغەمبـەر ﷺ زیـاتر جـەختی لـێ دەکاتـەوە و هانی گەنجان دەدات کە ژن بێنن وەك فەرموویەتی: (( يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ ، مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ )).

واتە: ئەی کۆمەڵی گەنجان ئەوانەتان کە توانای ژن هێنانتان هەیە لێـی مەوەستن ژن بێنن،چونکە بەڕاستی ژن هێنان کۆمـەڵێك سـودو قـازانجی بۆ مرۆڤ هەیە لەوانە:((فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ ))

واتە:یەکەم :ژن هێنان دەبێتە هۆکاری پاراستنی چاوەکان لە بینینی نامەحرەم.

دووەم:دەبێتە هۆکاری پاراستنی داوێنی مرۆڤەکان لە زینا وداوێن پیسی.

ئاشکرایە کە مرۆڤ ژنی هێناو بوو بە خاوەنی ماڵ و خێزانی خۆی ئیتر چاو ناگێڕێ بە شوێن ئافرەتانی نامەحرەمدا و لە هەمان کاتیشدا خۆی دەپارێزێ لە گوناهو تاوان وداوێن پیسی.

پاشان پێغەمبەر ﷺ چارەسەرێکی شەرعی دادەنێت بۆ ئەو کەسانەی کە توانای ژنهێنانیان نییە پێیان دەفەرمووێت:((وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ ، فَإِنَّ الصَّوْمَ لَهُ وِجَاءٌ))ئیمامی بوخاری گێڕاویەتییەوە.

واتە: هەر کەسێکیش نەیتوانی ژن بێنێ لە بەر ئەوەی کە توانای ماددی نیە و ناتوانێ ماڵ و خێزان بەیەکەوە بنێ ئەوە چارەسەری گونجاو بۆ ئەو بریتییە یە لە ڕۆژووگرتنی بەردەوام بۆ ئەوەی خۆی لە شەڕی شەهوەتی بپارێزێ و تووشی گوناهو تاوان و خراپەکاری نەیەت،چونکە ڕۆژوو گرتن توانایی شەهوەت کپ دەکاتەوە و لە تاوان و خراپەکاری دەیپارێزێ .

**کەواتە:ئەوە چارەسەرێکی شەرعییە بۆ ئەو گەنجانەی کە توانای ژن هێنانیان نیە با زیاتر بەڕۆژوو بن هەتاوەکو دەبێتە هۆی شکاندنی شەهوەت و ئارەزوویان.**

**وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە عوسمانی کوڕی مەزعون داوای کرد لە پێغەمبەر ﷺ ئیزنی بدات (خۆی بخەسێنێت ) و بە هیچ شێوازێك بیر لە ژن هێنان نەکاتەوە وخۆی یەکلایی بکاتەوە بۆ بەندایەتی و عیبادەت بۆ خوای پەروەردگار ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ لێی قبووڵ نەکرد و ئیزنی نەدا هەر بۆیە صەحابەکان ئەفەرموون: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ قبووڵی بکردایە عوسمان وای بکردایە ئێمەش وامان ئەکرد و وازمان لە ژن هێنان و ماڵداری وخێزانداری دەهێنا،بۆیە صەحابەکانیش بیریان لەو کارە نەکردەوە.**

**لە درێژەی فەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺ ئەوەمان بۆ ڕۆشن دەبێتەوە کە بەڕاستی ژن هێنان خۆی لە خۆیدا عیبادەت و بەندایەتییە و نابێتە هۆی ڕێگری لە بەندایەتی بۆخوای پەروەردگار،وەك ئەوانەی کە بە هەڵە تێگەیشتوون وا دەزانن ژن هێنان و شووکردن تەنها کاروبارێکی دونیاین و هیچ پەیوەندییەکیان بە پاداشتی دواڕۆژەوە نییە، خۆ ئەگەر**

**موسڵمانان لە هەر دوو ڕەگەزی نێرو مێ بەو شێوازە شەرعییەی کە ـ إن شاء الله ـ باسیان دەکەین  ماڵ و خانەوادە پێکەوە بنێن بەدڵنیاییەوە دەڵێین: بەشێکە لە دینداری و عیبادەت و بەندایەتی بۆ خوای پەروەردگار .**

**هەر بۆیە ڕۆژێکیان عبدالله ی کوڕی عەباس گەیشتە سەعیدی کوڕی جوبەیر و پێی فەرموو: (( هَلْ تَزَوَّجْتَ ؟ )) ئایا ژنت هێناوە؟ سەعیدی کوڕی جوبەیر لە وەڵامدا فەرمووی: نەخێر ژنم نەهێناوە،عبدالله فەرمووی: (( فَإِنَّ خَيْرَ هَذِهِ الأُمَّةِ أَكْثَرُهَا نِسَاءً ))ئیمامی بوخاری گێڕاویەتییەوە.**

**واتە:ژن بێنە چونکە بەڕاستی باشترینی ئەم ئوممەتە ئەوانەن کە ژنی زۆریان هەیە .**

**ئەم فەرموودەیە زانایان بە دوو شێواز لێکیان داوەتەوە: یەکەمیان:باشترینی ئەم ئوممەتە پێغەمبەرە ﷺ چونکە لە هەموومان ژنی زیاتر بووە ،ئاشکریە کە پێغەمبەر ﷺ زیاتر لە چوار ژنی هەبووە.**

**کەواتە:ژن هێنان و ماڵداری و دروست کردنی خانەوادە ڕێگە لە عیبادەت و بەندایەتی ناگرێت ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ هەشت نۆ خێزانی پێکەوە هەبووە لە گەڵ ئەوەشدا ڕێگای عیبادەت و بەندایەتی لێ نەگرتووە ئەوانەی وابیردەکەنەوە کە ژن هێنان ڕێگای بەندایەتیان لێ**

دەگرێ بێگومان بەهەڵەدا چوون ئەوەتە پێغەمبەر ﷺ خاوەنی هەشت نۆ خێزان بووە کەچی ڕێگای عیبادەتیشی لێ نەگرتووە.

مانای دووهەمی فەرموودەکە ئەوەیە کە عبدالله فەرمووی: ژن بێنە بەڕاستی باشترینی ئەم ئوممەتە ئەوانەن کە ژنی زۆریان هەیە بۆنمونە: ئەگەر گریمان دوو پیاو هەن لە عیبادەت و بەندایەتی و خواناسیاندا وەك یەکن بەڵام یەکێکیان دوو ژنی هەیە یان سیانی هەیە ئەوی تریان تەنها یەك ژنی هەیە کامیان لای خوا باشترە؟ دەڵێین: ئەوەیان کە دوو ژن یان سێ ژنی هەیە لەوە باشترە کە ژنێکی هەیە چونکە ئەوەیان کە خاوەنی دوو یان سێ خێزانە ئەجر و پاداشتی لای خوای پەروەردگار لەوە زیاترە کە یەك خێزانی هەیە ئەگەر بتوانێت دادپەروەر بێت لەنێوانیاندا،ئەوە مانای فەرموودەکەیە کە عبدالله ی کوڕی عەباس بە سەعیدی کوڕی جوبەیری فەرموو .

لێرەدا بۆمان دەرکەوت کە ژن هێنان و شوو کردن بەشێکە لە عیبادەت و دینداری و خواناسی لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا.

# حوکمی ژن هێنان و شوو کردن لە ئیسلامدا

لـە بنەڕتـدا ژن هێنــان و شــوو کـردن یەکێکـە لـەو سـوننتانەی کـە پێغەمبەرﷺ زۆر جـەختی لێکردووەتـەوە، بـەڵام حوکمەکـەی بـە پێـی مرۆڤەکان دەگۆڕێت وەك ئیمامی شەوکانی ڕەحمەتی خوای لە سەر بێ فەرموویەتی: ( قد علم بنصوص الكتاب والسنة و بإجماع الامة ان الزنا حرام وكذلك ما يؤدي اليه وما هو مقدمة له فمن خشي على نفسه الوقوع في هـذا وجب عليه دفعه عن نفسه فإن كان لا يندفع الا بالنكاح وجب عليـه ذلـك ). السيل الجرار المتدفق على حدائق الأزهار(١/٣٤٩).

واتە: بێگومان زانراوە بە پێی بەڵگەکانی قورئان وسوننەت و کۆدەنگی زانایانی ئیسلام کە زینا و داوێن پیسی و هەرشـتێکیش کـە سەربکێشـێ بۆی حەرامە ، وەهەر کەسێك لە خۆی بترسێ کـە تووشـی زینـا و داوێـن پیسی ببێ واجبە ئەو ترسە لەخۆی دوور بخاتەوە، خۆ ئەگـەر نـەیتوانی ئەو ترسە لە سەرخۆی لاببا بە ـ بەهۆی ڕۆژوگرتنەوە ـ ئەوکاتە واجبـە لە سـەری ژن بـێنێ بـۆ ئـەوەی خـۆی بپـارێزێ لـە شـەڕی شـەهوەتی و تووشی زینا و داوێن پیسی نەبێ .

کەواتە: ژن هێنان و شوو کردن لە حـەقی ئـەو کەسـانەدا واجبـە کـە لـە خۆیان دە ترسن تووشی زینا و داوێن پیسی بـبن، بـەڵام لـە سـەر جگـە لەوانە کە هیچ ترس و بیمێکیان نیە تووشی زیناو داوێن پیسی بـبن وەك

خۆی بەسوننەتی دەمێنێتـەوە، وەك ئـەو پیاوانـەی كـە ژنـی یەكـەمیان هەیە واجب نیە ژنی دووهەم بێنن،یان وەك ئەو پیاوانەی كەشـەهوەتیان لاوازە و بـە وشـێوازە نیـە كـە تووشـی گونـاهو تاوانیـان بكـات دیسـان لەسەریان واجب نیە كەژن بێنن تەنها سوننەتی موئەكەدەی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

پاشان لـە سـەر ئـەو پیاوانـەی كـە نـاتوانن ئـەركی بـەخێوكردنی مـاڵ و منداڵ بگرنە ئەستۆ یان ناتوانن پارێزگایی لە ماڵ و منداڵی خۆیان بكەن یان ناتوانن لـە گـەڵ ژنانـدا بـژین چـونكە كەسـانێكی تەبیعـەت ڕەقـن و هەڵسـوكەوتیان زۆر تونـدە و ژنـان نـاتوانن لەگەڵیانـدا ژیـان ببنەسـەر ئەمانـەش لەسـەر هەنـدێكیان حەرامـە و لەسـەر هەنـدێكیان مەكروهـە (ناپەسەندە) ژن بێنن.

بەهەمان شێوە ئافرەتێكیش كە نەتوانێ بـەمافی مێردەكـەی هەسـتێ و ئەركـەكانی بـۆ جێبـەجێ بكـات بـە تایبـەت لـە ڕووی جەسـتیەوە،یـان نەتوانێ ماڵداری خۆی بكـات و مـاڵ و منداڵـەكانی بـەخێو بكـات دیسـان مەكروهە(ناپەسەندە)شوو بكات.

كەواتە:ژن هێنان وشوكردن لە سەر هەندێك واجبە و لـە سـەر هەنـدێكی تـر سـوننەتە و لـە سـەر هەنـدێكی تـرش حەرامـە چـونكە نـاتوانن مـاف وئەركی سەرشانیان جێبەجێی بكەن.

# حیكمەتەكانی ژن هێنان و شوو كردن لە ئیسلامدا

هیچ شتێك نییە لە ئیسلامدا فەرمانی پێكرابێ یان ڕێگری لێكرابێ ئیلا چەند حیكمەتێكی تیادایە بەلاَم هەندێك جار حیكمەتەكانی نادیار و شاراوەن ئێمە هەستییان پێ ناكەین وە هەندێك جاریش دیار و بەرچاون و دەتوانین بیان ژمێرین، یەكێك لەو شتانەی كە فەرمانی پێكراوە وحیكمەتەكانیشی دیار و ئاشكران بریتییە لە ژن هێنان و شوو كردن.

## هەندێك لە حیكمەت و ئامانجەكانی ژن هێنان و شوو كردن لە ئیسلامدا

**یەكەم**/ ئامانجی گەورەی ژن هێنان و شوو كردن لە ئیسلامدا بۆ بتەو كردنی ئیمان و بیروباوەڕی ئەو كچ و كوڕەیە كەدەیانەوێ ماڵێك پێكەوە بنێنن و لانەیەك دروست بكەن،وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((إِذَا تَزَوَّجَ الْعَبْدُ فَقَدِ اسْتَكْمَلَ نِصْفَ الدِّينِ، فَلْيَتَّقِ الله فِي النِّصْفِ الْبَاقِي))السلسلة الصحيحة (٦٢٥).

واتە:كاتێك پیاو ژن ئەهێنێ نیوەی ئیمانی بۆ تەواو دەبێت مادام موسڵمانە و ئەهلی ئیمانە،دەبا لە نیوەكەی تریشدا لە خوای گەورە بترسێ وفەرمانەكانی جێ بە جێ بكات.

كەواتە: نیوەی ئیمان بەستراوە بەژن هێنان و ماڵداری و دروست كردنی خێزانەوە چونكە بەهۆی ژن هێنانەوە مرۆڤەكان دەتوانن خۆیان بپارێزن

لــە گونــاهو تــاوان و زینــا و داوێــن پیســی،هــەر بۆیــە پێغەمبــەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی کە نـاتوانیٚ ژن بـێنیٚ بـا ڕۆژوو بگـریٚ چـونکە ڕۆژوو گرتن دەبێتە هۆی کەمکردنە وەی شـەهوەت و تەسـك کردنـەوەی ئەو ڕێچکانەی کە شەیتان دەتوانیٚ بەهۆیانەوە مرۆڤەکان بەرەو گونـاهو تــاوان ببــات، ئەگــەر ڕۆژووگــرتن ئــەم کاریگەرییــەی هــەبێت لەســەر کەمکردنــەوەی شــەوهوەت و دامەزرانــدنی مــرۆڤ بێگومــان ژن هێنــان کاریگــەری زیــاتری دەبێــت و شــەهوەت و ئــارەزووی کــپ دەکاتــەوە، وەکاتێکیش ڕزگاری بوو لە کەف و کوڵی شـەهوەت ئـەو کاتـە بـەجوانی دەتوانێـت خـۆی لـە خراپــە و گونـاهو تـاوان بپارێزێـت.... لەئەنجامـدا نیوەی ئیمانی بۆ تەواو دەبێت،دەبا نیوەکەی تریشی لە خوا بترسیٚ لـە دەستگرتنی بە نوێژ و ڕۆژوو بەندایەتییەکانی تر کە لـە خـوای گـەورەی نزیکی دەکاتەوە.

لەئەنجامـدا بۆمـان دەرکـەوت کـە ژن هێنـان دەبێتـە هـۆی بتـەوبوونی ئیمانی مرۆڤ،هەر بۆیە پێویستە هەر گەنجێك ژن ئەهێنیٚ ئاگای لەم خاڵە بیٚ کە ژن هێنان تەنها بۆ خۆشی دونیا نییـە،بـەڵکو ژن هێنـان بـۆ بتـەو بوونی بیر و باوەڕ و بەندایەتی یە بۆ خوای پەروەردگار.

**وە هەروەها بە نیسبەت ئافرەتانەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:** (( إذا صَلَّتِ المَرْأَةُ خَمْسَها وصامَتْ شَهْرَها وَحَصَّنَتْ فَرْجَها وأطاعَتْ زَوْجَهَا قِيلَ لَها أدْخُلِي الجَنَّة مِنْ أيِّ أبْوابِ الجَنَّةِ شِئْتِ )) صَحِيح التَّرْغِيبِ وَالتَّرْهِيب: (١٩٣١).

**واتە: هەر كاتێك ئافرەت پێنج فەرزەی نوێژەكانی خۆی بەڕێكوپێكی ئەنجام بدات، وە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرێت و داوێنی خۆی لە زینا و داوێن پیسی بپارێزێت و گوێڕایەڵی مێردەكەی بكات و دڵی مێردەكەی خۆی نەشكێنێت ـ هەڵبەتە گوێڕایەڵی مێردیش نابێت لە فەرمانی خوا و پێغەمبەر ﷺ بچێتەدەرەوە ـ لە ڕۆژی دوایدا پێی دەووترێت:لە هەر دەرگایەك لە دەرگاكانی بەهەشت كە خۆت ئەتەوێ فەرموو بچۆرە ژوورەوە .**

**لەم فەرموودەیەدا بۆمان دەردەكەوێت نیوەی ئیمان و بیروباوەڕی ئەو ئافرەتانەی كە خاوەن مێردن بەستراوەتەوە بە گوێڕایەڵی كردنی مێردەكانیانەوە و نەشكاندن و ڕازی كردنی دڵی مێردەكانیان، وە لە هەمان كاتدا پاراستنی ناموس و لاشەی خۆیانە لە زینا و داوێن پیسی، چونكە ئافرەتان ناموس و شەرەفی پیاوانن خۆ ئەگەر خۆیان نەپارێزن لە داوێن پیسی و خراپەكاری هەر وەكو ئابڕووی خۆیان ئەچێ بە هەمان شێوە ئابڕووی مێردەكانیشیان ئەچێ.**

وە ئەمەش بە پێشێل کردنی مافی مێرد دادەنرێت وە نیوەکـەی تریشـی پەیوەنـدی دارە بــە عیبــادەتی خــوای گــەورەوە لــە نوێــژ و ڕۆژوو بەندایەتییەکانی تر.......

کەواتە: ژن هێنان و شوو کردن بـە نیسـبەت پیـاو ژنـەوە دەبێتـە هـۆی بتەو بوونی ئیمان و بیروباوەڕی هەردوکیان.

هەر کوڕ و کچێك لـە دوای قۆنـاغی ژن هێنـان و شـوو کـردن کەچـوونە قۆنـاغی درووسـت کردنـی مـاڵ و خێزانـەوە ئەگـەر بـۆ لای پـەروەردگار نەگەڕانەوە و لە گونـاهو تـاوان پەشـیمان نەبوونـەوە ودەسـتیان نـەکرد بەجێ بەجێکردنی بەندایەتییەکان ئـەبێ ئەمانـە چ خێـر و خۆشـیەك لـە درووست بوونی ئەم خێزانە ببینن کە هێشتا ماڵەکانیان نەڕازاندووەتەوە بەنوری ئیسلام و شوکرانە بژێری پەروەردگار لە سەر بەهرەکانی!

ئەگەر ئەتەوێت بە بەختەوەری بژیت و دوور بیت لە ئاشووب و ئاژاوەی نـاو مـاڵ و خێـزان ڕووبکـەرە خـوای پـەروەردگار هـەر لـە سـەرەتای گەنجیتـەوە، هـەر لـە کـاتی ژن هێنـان و شـووکردنتەوە، دڵـت ئـاوەدان بکـەرەوە بـە بەندایـەتی بـۆ خـوای پـەروەردگار و پەیوەندییـەکی بتـەو لەگەڵ خوای خۆتدا دروست بکە کە بـە هـیچ شـتێك نەبچڕێ، بەتایبـەت دایکان وخوشکان با ئاگایان لە مافی مێردەکانیان بێ و هـەوڵ بـدەن لـە

خۆیانیان ڕازی بکەن وە ئەمـەش گـەورەترین سـەربەرزی و شـانازی یـە بۆیان چونکە سەربەرزی و ڕوو سووری ڕۆژی قیامەتی پێوەبەندە.

ئەمە مژدەیەکی گەورەیە بۆ دایکان و خوشکان ئەم فرسەتە لە دەسـتی خۆیان نەدەن گرنگی بە نوێژ و ڕۆژووەکانیان بدەن و دڵی مێردەکانیـان لە خۆیان نـەڕەنجێنن لـە چوارچـێوەی شـەرعدا لەگـەڵ پـەروەردەکرنی منداڵەکان بە جوانی و پاراستنی داوێنیان لەخراپەکاری بەسـە بۆئـەوەی کە بچنە بەهەشتەوە بەویستی خوای گەورە.

**دووهەم**: ژن هێنان و شوو کردن بۆ درێژە پێدانی ڕەوڕەوەی ژیـانی مرۆڤەکانە لە زەویـدا خـۆ ئەگـەر بێتـوو ئـەمکارە هـەتا سـەد ساڵی تـر ڕوونەدات هەموو مرۆڤەکان دەمرن و کۆتاییان پێـدێ ،بـەڵام بـەهۆی ژن هێنان و شووکردنەوە درێژە ئەدرێ بە زنجیرەی ڕەگەزی مرۆڤایـەتی لـە زەویدا وکۆتایی بە ژیانیان نایەت.

وەك خوای گەورە فەرمویەتی:{ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً........(١)} سورەتی نیساء.

واتە: ئەی خەڵکینە لـە تـوڕەیی ئـەو پـەروەردگارە خۆتـان بپارێزن کـە ئێوەی لە تاکە نەفسێك درووستکردووە و لەو نەفسـەیش هاوسـەرەکەی

**بۆ بەدی هێناوە، وە هەر لەو دوانەش پیاوان و ژنانی زۆری خستوەتەوە ودروستكردوە.**

**ئەگەر ئێستا سەیرێكی جیهان بكەین ئەو هـەمووە پێشـكەوتنەی ئـەمڕۆ هەیـە هـەمووی بـۆ خزمـەتی مرۆڤـەكان دروسـت بـووە لەهـەمان كاتـدا هەمووی خانەكی زیندووی پیێ دروست ناكریێ، بەڵام كاتێك ئافرەتێك لـە گەڵ پیاوێك ئەگەن بـە یـەك بەویسـتی خـوای پـەروەردگار گـەوەرترینی پڕۆژە لەسەر زەوی پـەیادا ئـەبیێ لـە نێوانیانـدا كـە ئـەویش بریتییـە لـە دروسبونی مرۆڤێك.**

**كەواتـە:بەدڵنیاییـەوە ژن هێنـان و شـووكردن پڕۆژەیـەكی زۆر گەورەیـە چـونكە درووسـت بـوونی مرۆڤـەكانی لـیێ ئەكەوێتـەوە، بۆیـە پێویسـتە ئەوەی لە توانایدا هەیـە ژن بـێنیێ بـا لێـی نەوەسـتیێ ،وە هـەروەها ئـەو ئافرەتانـەی كـە توانـای شـوو كـردن و پـەروەردەكردنی مـاڵ ومنـداڵ و بـەڕێوەبردنی مـافی مێردیـان هەیـە بـا بـۆ خۆیـان مێـرد بكـەن ئەگـەر كەسێكی دینـدار و ڕەوشـت بـەرز هاتـەخوازبێنیان وەك لـە دەرسـەكانی داهاتوودا دێینە سەری ـ ان شاء اللە.**

**سێهەم: ژن هێنـان و شـوو كـردن بـۆ درووسـتبونی شەخصـیەت و كەسایەتییە بۆ ئەو پیاو ژنە، چونكە كوڕ وكچ هەتالە ماڵی باوكیان بن، شەخصیەت و كەسایەتی و زیرەكی و لێزانـی و بـەتواناییان دەرناكـەویێ**

چونكە هێشتا سەربەخۆییان وەرنەگرتوە،بەلاَم كاتێك خۆیان خێزانێك درووست دەكەن و ماڵێك پێكەوەدەنێن لێهاتوویی و سەخاوەت و هەموو سیفاتە جوانەكانیان دەردەكەوێ، یان بەپێچەوانەوە چروكی ونالەباری و هەموو سیفەتە خراپەكانیان دەردەكەوێ.

كەواتە: ژن هێنان و شووكردن ئەبێتە هۆی دەرخستنی شەخصیەت و كەسایەتی مرۆڤەكان خۆ ئەگەر ئینسانێكی چاك و باش بن خێزانێكی بەختەوەر و چاك بە یەكەوە دەنێن و زیاتر كەسایەتیان دەردەكەوێ و دەبنە هۆی دڵخۆشكردنی هەردوو خانەوادەی بوك وزاوا، بەلاَم ئەگەر كەسانێكی خراپ بن ناتوانن سەركەوتن بەدەست بهێنن لە درووستكردنی خانەوادەیەكی ئاوەدان و بەختەوەر سەرەنجام دەبنە سەرێشە بۆ باوك ودایك و هەموو دڵسۆزان.

**چوارەم**/ ژن هێنان و شووكردن بۆ ئارام بوون وسوكنا بونی پیاوە لەگەڵ پەیدا بوونی سۆزو خۆشەویستی لە نێوانیان ژن وپیاودا.

وەك خوای پەروەردگار لە قورئاندا فەرموویەتی:﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (٢١)﴾ سورەتی رووم.

واتە:بەڕاستی لە ئایات و نیشانەكانی ئێمەیە كە خوای پەروەردگار هاودەم و هاوسەرێكی لەنەفسی خۆتان بۆ دروست كردوون بۆئەوەی كە

**پێی سوکنا ببن،وەهەروەها سۆزو خۆشەویستیشی لەنێوانتاندا فەراهەم هێناوە،بەڕاستی ئەم نیشانانە جێگەی پەند وەرگرتنە بۆ کەسانێك کە بیر بکەنەوە.**

**کاتێك خوای پەروەردگار فەرموویەتی:** {أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا}

**واتە: یەکێکە لە ئایەتەکانی ئێمە کە لە نەفسی خۆتان هاودەممان بۆ دروست کردوون، ئاماژەیە بۆ ئەوەی ئەگەر بهاتایە هاوسەری پیاوان لە ڕەگەزی خۆیان نەبوایە مرۆڤەکان هەرگیس نەیان دەتوانی بە ئیسراحەت لە گەڵیاندا بژین،بۆیە خوای پەروەردگار وەکو نیعمەتێك لە نیعمەتەکانی خۆی ئەمەمان بۆباس دەکات کە هاوسەری لە ڕەگەزی خۆمان بۆ درووستکردوین، هەتابتوانین لە گەڵیاندا بژین چونکە ئوسلوب وهەڵسوکەوتمان وەك یەکە،شێوەی ژیانمان وەك یەکە خواردن و خەوتنمان وەك یەکە لە زۆربەی سیفەتە کانماندا وەك یەکین.**

{لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا} **واتە: بۆ ئەوەی ئێوە ئارام و دامەزراوبن و سوکنابن پێیان لە ڕووی دەروونییەوە،سەرە ڕای ئەوەی کە لە ژیانی خۆماندا چەندین گەنجمان بینیوە کە زۆر سەرەڕۆ و هەڵەشە بوون پێش ژن هێنانیان بەڵام لە دوای قۆناغی ژن هێنان و دروست کردنی ماڵ و خانەوادە مرۆڤێکی هێمن و لەسەرخۆ و دامەزراوی لێ پەیدا بووە.**

{وَجَعَـلَ بَيْـنَكُم مَّـوَدَّةً وَرَحْمَـةً}واتـە: لـە نێـوان ژن و پیـاودا سـۆزو خۆشەویستیمان دروست کردووە، دەبینین کوڕو کچێك کاتێك زەواج دەکەن و بەیەك دەگەن سۆزو خۆشەویستییەك لە نێواندا دروست دەبێ کە لە نێوان هیچ دوو کەسێکدا بەو شێوازە درووست نابێ.

کەواتە: دروست بوونی سۆز و خۆشەویستی لە دوای قۆناغی ژن هێنـان وشوکردنە،نەك پێش ئەوقۆناغە وەك ئەمڕۆ کەسانێك وابیر دەکەنەوە کە پێویستە بەر لەوەی ژن بێنێ لە گەڵ کچێکدا پەیوەندی هەبێ و نامە بگۆڕێتـەوە و تەلـەفۆنی لـە گەڵـدا بکـات و ماوەیـەك بەیەکـەوە بـن و بەویستی خۆیان سەفەر بکەن و هەندێك یادگاریان لەگەڵ یەکتردا هەبێت و....... یـەعنی ئەوکەسـانە ئەمـە بـەهۆکاری درووسـت بـوونی سـۆز و خۆشەویسـتی دادەنـێن، بـەڵام خـوای پـەروەردگار قۆنـاغی دوای گواستنەوەی داناوە کە سۆز وخۆشەویستی تیادا درووست ببێ،چونکە گومانی تیادا نیە ئەو ڕەحمەت و میهرەبانی و سۆزەی کە لە دوای ژن هێنان و شوو کردنەوە پەیدا ئەبێ بریتی یە لە سۆز و خۆشەویستییەکی ڕاست و درووست، بەڵام ئەو سۆز و خۆشەویستیەی کە لە نێوان کوڕ و کچێکدا بە ڕێگەی ناشەرعی درووستبووە، زۆر جار پاش ماوەیەکی کەم خیانەت لە یەکتر دەکەن و متمانـەیان بـە یـەکتر نامێنێت و....چەندین شتی تریش، وە سۆز و خۆشەویستیەکەیان هەتا سەر نابێت خۆ ئەگەر

زەواجیش بکەن ئەبینین زۆر بەیان سەرکەوتوو نابن بەتایبـەت ئەوانـەی کە بەو شێوازە بەیەك گەیشتوون و چەندین ساڵ و مانگ بەیەکەوە بوون لە سەر بناغەیەکی ناشەرعی.

پاشان خوای گەورە فەرموویەتی:{إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ}

واتە: ئا ئەمەی کـە باسمـان کـرد ـ لـەوەی کـە خـوای پـەروەردگار لـە جنسـی خۆمـان هـاودەم و هاوسـەرێکی بـۆ دروسـت کـردووین و دەبنـە سوکنا بۆ پیاوان، لەوەی کـە ڕەحمـەت و سـۆز و میهرەبـانی دەکەوێتـە نێوانیـان ـ بەڕاسـتی شـوێنی دەرس وەرگـرتن و شـوێنی تێفکـران و ووردبوونەوەیە لە ئایەت و دەسەڵاتی خوای پـەروەردگار بەڕاسـتی هـەر ئەو خاوەنی گەورەیی و نیعمەتی زۆرە بەسەر مانەوە.

# بەشی دووهەم

# ئەو سیفەتە باشانەی کە پێ ویستە هەبن لە کچان و کوڕاندا

بۆ ئەوەی کچان و کوڕان ژیانێکی پڕ ئاسوودەیی پێکەوە بنێن و بە کامەرانی ژیان ببەنە سەر،وە دووچاری کێشمە کێشمی خێزانی نەبنەوە پێویستە پەلە نەکەن و ئارام بگرن هەتا باشترین کوڕ یان باشترین کچێك دەبیننەوە کە زۆر ترین سیفەتە جوان و چاکەکانیان تیادا کۆ بوو بێتەوە،وەك بە کورتی ڕوونیان دەکەینەوە.

**تەوەری یەکەم**: دێینە سەر ئەوسیفەتە چاکانەی کە پێویستە هەبن لە ئافرەتاندا:

یەك:دینداری و خواناسی کە پێویستە بوونی هەبێ لەو ئافرەتەی کە تۆ دەتەوێت بیکەیتە دایکی منداڵەکانت وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لأَرْبَعٍ )).

واتە: عادەتی خەڵك وایە ئافرەتان دەخوازن لە بەر ئەم چوارسیفەتە:

١/(( لِمَالِهَا )) واتە: هەندێك خەڵك هەن ئافرەتان دەخوازن لە بەر ئەوەی کە ئافرەتێکی ماڵدار و دەوڵەمەند و خاوەن سەروەت و سامانە .

٢/ (( وَلِحَسَبِهَا )) خەڵكانێكی تر هەن ئافرەتان دەخوازن لە بەر ئـەوەی كە خانەدان و خاوەن حەسەب و نەسەب و بنەماڵـەن خـەڵكێكن خـاوەن پێگەی كۆمەڵایەتی بەرز و گەورەن لە ناو موسڵمانانـدا .

٣/((وَلِجَمَالِهَـا )) خـەڵكانێكی تـریش هــەن كـە زیـاتر شـۆخ و شـەنگی ئافرەت و جوانی ئـافرەت ڕەچـاو دەكـەن و بـە شـوێن ئـەو ئافرەتانـەدا دەگەڕێن.

٤/ (( وَلِدِينِهَا )) وە هەروەها خەڵكانێكی تر هەن كە بە شـوێن ئـافرەتی دینـدار و خواناسـدا دەگـەڕێن ئـەو ئافرەتانـەی كـە دەسـتیان بـە دیـنی خواوە گرتووە وداپۆشراو وپۆشتەن.

پاشـان پێغەمبـەر ﷺ بۆمـان دیـاری دەكـات كـام لـەم چـوار سـیفەتە هەڵبـبژێرین ودەست بە كامیانەوە بگـرین دەفـەرمووێت: (( فَـاظْفَرْ بِـذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ )) ئیمامی بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

واتە:هەوڵبدە ئەوەیان بۆ خۆت هەڵبـبژێرە ئەوەیان بۆ خۆت ببەرەوە كە خاوەن دین و بەندایەتیە.

ئەو ئافرەتانەی كە لەخوا ترسن ودەسـتیان بـە دیـنی خـواوە گرتـووە و جوانی و ڕازاوەیی خۆیان بۆ خەڵك دەرناخەن،بەبێ پۆشاكی شەرعی لـە

**ماڵ نایەنە دەرەوە، ئافرەتانێکی بەحەیا و شەرمن، پارێزگاری لە دین و شەرەف و حەیای خۆیان دەکەن، ئەوانە بۆ خۆتان هەڵبژێرن .**

**جوولەکەکان حەزیان لەوە بوو ئافرەتێك بخوازن کە دەوڵەمەند بێ، عەرەبەکان حەزیان لە ئافرەتێك بووە کە خاوەنی حەسەب و نەسەب بێ ،گاورەکان حەزیان لە ئافرەتی شۆخ وشەنگ و جوان بووە.**

**پێغەمبەر ﷺ جیاواز لە بیرکردنەوەی ئەوان سیفەتی چوارەمی بۆ ئومەتەکەی پەسەندکردووە کە پێویستە خاوەن دین بێ (فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ).**

**دیندار بۆ خۆت هەڵبژێرە،ئەمەش بەسیفەتی یەکەم دادەنرێت.**

**دەبینین کەسانێك جوانیان دەوێ و کەسانێکی تریش سەروەت و سامان و کەسێکی تر حەسەب ونەسەب ،ئیتر ناکۆڵنەوە لەوەی ئاخۆ ئەم کچە دەستی بەدینەوە گرتووە یان نا چونکە هەموویان دڵیان بە ڕازاوەیی ودەوڵەمەندی و جوانی دونیاوە خۆش و بەندە،مەبەست ئەوەنییە کە لە نەسەب وحەسەب وجوانی ئەو کچە نەپرسیت بەڵکو مەبەستەکە ئەوەیە بامەرجی یەکەمت دینداری و لەخواترسان وپۆشتەیی ئەو ئافرەتە بێت ،چونکە دەوڵەمەندی و جوانی و نەسەب و حەسەب ئەگەر لە خواترسانی لەگەڵدا نەبێت سودێکی ئەوتۆی لێنابینیت و هەر زوو نێوانتان تێکدەچێت وناتوانن بە خۆشی وکامەرانی**

بەیەکەوە بژین،وە لەلایەکی تریشەوە ئـەم ژیانـە هەرچـۆنێك بـێ ڕۆژێـك دێت بگەڕێینەوە بەر دەستی خوای پـەروەردگار و جـوانی و ڕازاوەیـی و خۆشی و دەوڵەمەندی دونیا هەمووی بە جێ بهێڵین.

کەواتـە: باشـتر وایـە هاوسـەر و هاودەمێـك بـۆ خۆمـان بدۆزینـەوە کـە یارمەتی دەرمان بێ بۆ دیـن ودونیامـان ،کۆمـەکی کارمـان بـێ بـۆ بتـەو کردنی ئیمان و هەموو کار وکردەوەیەکی بـاش نـەك هانـدەرمان بـێ بـۆ گونـــاهو تـــاوان و خراپـــەکاری و هـــەر ڕۆژەی بیانویـــەك بدۆزێتـــەوە بۆسەغڵەتکردن و دڵتەنگکردنی پیاوەکەی.

٢/ ئەو ئافرەتانەی کە زۆر خاوەنی حەنان و سۆزن لە گەڵ منداڵەکانیان خۆ ئەگەر لـە حاڵەتێکدا بـە قـەدەری خـوای پـەروەردگار مێردەکانیـان بمرێ و تووشی بەڵا و موسـیبەتێك بـبن ئەوەنـدە منداڵـەکانی خۆیانیـان خـۆش ئـەوێ دەسـتیان لـێ هـەڵناگرن و بچـن شـوو بکـەن، بـەڵکو بەسەریانەوە دادەنیشن و پەروەردەیان دەکەن ئەمە جـوانترین سـیفەتە لە ژناندا هەبێ کە بە ئەو پەڕی حـەنان وسـۆزەوە منداڵـەکانی بـە خێـو بکـات و ئاگـای لـە هەڵسـوکەوتیان بـێ و میهرەبـان و بەبـەزەیی بـێ بەرامبەریان.

**وەك پێغەمبەر ﷺ لە وەسفی ژنە باشەكانی قورەیشدا فەرموویەتی: ((خَيْرُ نِساءٍ رَكِبْنَ الإِبِلَ صالِحُ نِساءِ قُرَيْشٍ أحْناهُ على وَلَدٍ في صِغَرِهِ وأرْعاهُ على زَوْجٍ في ذاتِ يَدِهِ ))ئیمامی بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.**

**واتە: باشترین ژنانێك كە سواری ووشتر بووبن ژنە باشەكانی قورەیشن لە بەر ئەوەی زۆر بەسۆز و بەزەیین بەرامبەر منداڵەكانیان لە كاتی بچوكیدا.**

**٣/ ئەو ئافرەتانەی زۆر پارێزگاری دەكەن لە ماڵی مێردەكانیان وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:((وأرْعاهُ على زَوْجٍ في ذاتِ يَدِهِ))**

**واتە: پارێزگاری لە ماڵی مێردەكانیان دەكەن ، هەڵبەتە زۆر ژن هەن بەس دینارێك بە مێردەكانیانەوە شك ببەن چەندین ڕێگە دەگرنە بەر بۆ خەرجكردنی بەڵكو جاری وای هەیە هەر لە سەرەتای مانگەوە ئەوەندە شت بەقەرز دەهێنێن كە معاشی مانگەكەی تریش هێشتا بەشی بژاردنی قەرزەكان ناكات، چونكە هەمیشە سەرقاڵی گۆڕینی مۆدێلی ماڵن، ئیتر گوێ بەوە نادەن هەیانە یان نا بەڕاستی ئەمە سیفەتێكی زۆر خراپە، وە ئەوجۆرە ژنانەش بە باش دانانرێن كەپارێزگاری لە ماڵ وسەروەت وسامانی مێردەكانیان ناكەن.**

**٤/ ئەو ژنانەی كە زۆر منداڵیان ببێ و مێردەكانیان خۆش بوێ وەك**

**پێغەمبەر ﷺ فەرمویـەتی:**(( تَزَوَّجُوا الْوَدُودَ الْوَلُودَ فَإِنِّی مُكَاثِرٌ بِكُمُ الأُمَمَ ) صَحِیح الْجَامِع: (٢٩٤١).

**واتە: ژنانێك بێنن كە زۆر منداڵیان ببێ وخـاوەنی سـۆز و خۆشەویسـتی بن بۆمێردەكانیان، بەڕاستی من لە ڕۆژی دوایدا شانازی دەكـەم بـەزۆری ئومەتەكەمەوە .**

**((الْوَلُـود)) ئافرەتـانێكبن كـە زۆرمنـداڵیان بـبێ ، مەبەسـت ئەوەیـە لـە بنەماڵەیەك بن كە منداڵیان زۆر ببێ بۆئـەم مەبەسـتەش سـەیری دایـك و خوشك و پورەكانی دەكرێت چونكە كچێك هێشتا شووی نەكردووە هـیچ شتێكی پێوە دیارنیە.**

**كەواتە:زۆر بوونی ئوممەتی ئیسلام شانازییە بۆ پێغەمبەر ﷺ بەڵام بەو مەرجە دەست بە ئیسلامەوە بگرن چونكە هەتا موسـڵمانێك زیـاتر بـێ و سوژدەیەك زیاتر بۆ خوای گەورە ببات خێر و حەسەناتی پێغەمبـەر ﷺ زیاتر دەبێت.**

**((الْوَدُودَ)) بە دوو شێواز لێك دراوەتەوە:**

**یەكــەم: وەدود یــانی ئــەو ئافرەتانــەی كــە لــە بــەر زۆری ســیفەتە جوانەكانیان زۆر لای مێردەكانیان خۆشەویستن .**

**دووەم: ئافرەتانێكن كە مێردەكانی خۆیانیان زۆر خۆش دەوێ و چاویان تەنها لە سەر مێردەكانی خۆیانە و ڕێز و حورمەتی زۆریان لێدەگرن.**

**٥/ سوننەت وایە مرۆڤ  کە ژنی هێنا کچ بێنێ ، هەرچەندە پێغەمبەر ﷺ لە ژیانی خۆیدا تەنها کچێکی هێناوە کە دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشەیە ئیتر هەموو خێزانەکانی تری بێوەژن بوون ، بەڵام ئەگەر مرۆڤ بۆی بگونجێ باشتر وایە کچ بێنێ،خۆ ئەگەر بۆشت نەگونجا یان وا بۆ تۆ باشتر بوو کە بێوەژن بێنی هیچی تیادانیە چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ بێوەژنی هێناوە و دروستە.**

**جابری کوڕی عبدالله ـ خوایان لێ ڕازی بێ ـ فەرمویەتی:**أَنَّ عَبْدَ اللهِ هَلَكَ وَتَرَكَ تِسْعَ بَنَاتٍ أَوْ قَالَ سَبْعَ بنات فَتَزَوَّجْتُ امْرَأَةً ثَيِّبًا فَقَالَ لِي رَسُولُ اللهِ - صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - يَا جَابِرُ تَزَوَّجْتَ قَالَ قُلْتُ نَعَمْ قَالَ فَبِكْرٌ أَمْ ثَيِّبٌ قَالَ قُلْتُ بَلْ ثَيِّبٌ يَا رَسُولَ اللهِ قَالَ فَهَلَّا جَارِيَةً تُلَاعِبُهَا وَتُلَاعِبُكَ أَوْ قَالَ تُضَاحِكُهَا وَتُضَاحِكُكَ قَالَ قُلْتُ لَهُ إِنَّ عَبْدَ اللهِ هَلَكَ وَتَرَكَ تِسْعَ بَنَاتٍ أَوْ سَبْعَ بنات وَإِنِّي كَرِهْتُ أَنْ آتِيَهُنَّ أَوْ أَجِيئَهُنَّ بِمِثْلِهِنَّ فَأَحْبَبْتُ أَنْ أَجِيءَ بِامْرَأَةٍ تَقُومُ عَلَيْهِنَّ وَتُصْلِحُهُنَّ قَالَ فَبَارَكَ اللهُ لَكَ أَوْ قَالَ لِي خَيْرًا ))السلسلة الصحيحة (١٠٢٢).

**واتە: ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ بە جابری کوڕی عبدالله ی فەرموو کە تازە ژنی هێنابوو: ئەی جابر کچت هێناوە یان بێوەژن؟ جابر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێوەژنم هێناوە،فەرمووی: بۆچی کچێکت نەهێناوە کە زیاتر یاریت لە گەڵدا بکات و تۆش زیاتر یاری لە گەڵدا بکەیت؟**

جابر فـەرمووی: ئـەی پێغەمبـەر ﷺ بـاوکم لـە شـەڕی ئوحـود شـەهید بووەو منیش چەند خوشکێکم هەیە و ویستوومە ژنێك بێنمـە ناویـان کـە لێـزان بـێ لــە پــەروەردە کردنیــان و لــە بــەخێوکردنیان بــۆ ئــەوەی خوشکەکانم نەفـەوتێن، نەمویسـتووە کچێك بێنمـە ناویـان وەك خۆیـان وابێ لە شێوازی تەربیەت دانی منداڵ و بەخێوکردنیان زۆر شارەزا نـەبێ ، پێغەمبـەر ﷺ ئافـەرین و دەسـت خۆشـی لێکـرد و فـەرمووی: خـوای گەورە پیرۆزی بکات.

کەواتە:باشتر وایە خوازبێنی کچێك بکەیت خۆ ئەگەر لـە بـەر هۆکـارێکی شەرعی بێوەژنت هێنا لەبەر ئەوەی بۆ تۆ باشتر بوو وەك ووتمـان: هـیچ کێشەیەکی تیادانیە ودرووستە.

٦/ سیفەتێکی تر لەو سیفەتانەی کە پێویستە هەبن لـە ئافرەتانـدا وەك لە فەرمودەیەکی تردا هاتوە(( الَّتِي تَسُرُّهُ إِذا نَظَـرَ))واتـە: ئـەو ئافرەتـەی کاتێك مێردەکـەی سـەیری دەکـات دڵـی پێخـۆش دەکـات لـە بـەر زۆری سـیفەتە جوانــەکانی وەك خواناسـی وشــەرمکردن و زمــان شـیرینی و ڕەوشت بەرزی و ڕووگەشی و ڕووخۆشی لە گەڵیدا.

٧/ (( وَتُطِيعُهُ إِذا أَمَرَ )) واتە:مێردەکەی هەر فەرمانێکی بەسـەردا بـدات بەبێ چەند وچوون جێبەجێی بکات و موناقەشەی لە گەڵدا نەکات و لـەو جۆرە ئافرەتانە نەبێت مێردەکەی هەر چـیەکی ووت ئـەو پێچـەوانەکەی

بجوولێتەوە، بـەڵام ئـەوەمان لـەبیر نەچـێ گوێڕایـەڵ بێـت لـە سـنووری شەرعدا ئەگەر مێردەكـەی هـەر شـتێكی پێـی ووت مـادەم لـە سـنووری شەرع دەرنەچوو بوو پێویستە جێبەجێی بكات.

٨/ (( ولا تُخالِفُهُ في نَفْسِها ولا مالِها بِما يَكْرَهُ ))السلسلة الصحيحة (١٨٣٨).

واتە: وە ئەو ئافرەتە پێچەوانەی مێردەكەی نەجوولێتەوە چ لە شتێكدا كە پەیوەندی بەنەفسی خۆیەوە هەبێت یان بـە سـەروەت و سـامانیەوە كە مێردەكەی پێی ناخۆش بێت.

كەواتـە:بـەپێی ئـەم فەرمودەیـە پێویسـتە ئافرەتـان هـەوڵ بـدەن دڵـی مێردەكانیان ڕابگرن وببنە جێگەی ڕەزامەندیان و بە شێوازێك تەسەڕوف نەكەن لە خەرجكردن و سەرەفكردنی سـەروەت وسـامانی خۆشـیان كـە ببێتە جێگەی تووڕەی مێردەكانیان.

## تەوەرەی دووهەم: ئەو سیفەتە چاکانەی کە پێویستە لــە پیاواندا هەبن

لــەدوای باســکردنی ســیفەتە چــاکەکانی ئافرەتــان دێینــە ســەر باســی سیفەتە چـاکەکانی پیـاوان چـونکە کچـانیش بۆیـان هەیـە بپرسـن ئایـا سیفەتی ئەو پیاوانە دەبێ چۆن بێ کە هاتنە پێشەوە و خوازبێنیان کرد نابێ دەست بە ڕوویانەوە بنرێت.

وەڵامی ئەمە لە پێغەمبەر ﷺ وەربگرە:(( إِذَا جَاءَكُمْ مَنْ تَرْضَـوْنَ دِينَـهُ وَخُلُقَهُ فَأَنْكِحُوهُ ))

واتە:ئەگەر پیاوێك هاتە داخوازی کچەکانتان و ئێـوە لـە دیـن وڕەوشـتی ڕازی بوون ژنی بدەنێ و لێی مارەبکەن.

بەڕێزان دین بریتی یە لە عیبادەت و بەندایەتی بۆ خوای پــەروەردگار لــە نوێژ و ڕۆژوو و زەکات وحەج و چاکە کردن و دوور کەوتنەوە لە گونـاهو تــاوان و خراپــەکاری، بەواتایــەکی تــر جێبــەجێ کردنــی واجبــەکان و دوورکەوتنەوە لەشتە حەرامکراوەکان.

ئەخلاق و ڕەوشتیش بریتی یە لە وەی کە ئەو پیاوە خـاوەن عیـززەت و خوڕەوشتی بـەرزبێت و ئوسـلوب وهەڵسـوکەوتی ڕێکوپێـك بێـت لەگـەڵ خەڵکدا و بتوانێت لە گەڵ دەور و بەری خۆیـدا بـژی و کەسـێکی دەسـت پیس وخیانەتکار و درۆزن و ڕەزیل و ڕەق ووشك نەبێت کە هیچ کەسـێك

نەتوانێ لەگەڵیدا بژی،وە بە تایبەت لە گەڵ ماڵ و خێزانیدا پێویستە کەسێکی نەرم ونییان و لەسەر خۆ بێت و ڕێز لە خێزانی خۆی بگرێت و بە چاوی سووکەوە تەماشای نەکات وجوێن و قسەی ناشرینی پێ نەڵێی چونکە کەسانێك هەن نوێژ دەکەن و ڕۆژوو دەگرن و بگرە چاکەش دەکەن بەڵام لە هەمان کاتدا زۆر بە ناشیرینی هەڵسوکەوت دەکەن لە گەڵ خێزانەکانیاندا و کەسانێکی جنێو فرۆش و نالەبار و تەبیعەت ووشکن هەتا جاری واش هەیە جنێوی ناشیرین بەباوك ودایك وخوشکی خێزانەکەی دەڵێت بەڕاستی ئەمە بەیەکێك لە گوناهە گەورەکان دادەنرێت وەك پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((إِنَّ مِنْ أَكْبَرِ الْكَبَائِرِ أَنْ يَسُبَّ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ قَالَ وَكَيْفَ يَسُبُّ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ قَالَ يَسُبُّ أَبَا الرَّجُلِ فيسب أباه ويسب أمه فيسب أمه)) التعليقات الحسان على صحيح ابن حبان (٤١٣).

واتە: بەڕا ستی لە تاوانە زۆر گەورەکانە کەمرۆڤ جوێن بدات بە دایك و باوکی خۆی،ووتیان چۆن مرۆڤ جوێن دەدات بە دایك وباوکی ،فەرمووی: جوێن بەدایك و باوکی خەڵك دادات لە ئەنجامدا خەڵکیش جوێن بەدایك وباوکی ئەو دەدەن.

وە لە فەرمودەیەکی تردا پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:((لَيْسَ الْمُؤْمِنُ بِالطَّعَّانِ وَلاَ اللَّعَّانِ وَلاَ الْفَاحِشِ وَلاَ الْبَذِيءِ )) صَحِيح الْجَامِع:(٥٣٨١).

واتـە: بەڕاسـتی موسـڵمان تـوانج و تەشـەر و نـەفرەت لەخـەڵك ناكـات و كەسێكی زمان پیس وجوێن فرۆش نییە و قسەی ناشـرین و نابـەجێ بـە دەمیدا نایەت.

لەئیسـلامدا زۆر گرنگـی دراوە بـە بابـەتی ڕەوشـت وئاكـاری جـوان وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((أَثْقَلُ شَيْءٍ فِي الْمِيزَانِ خُلُقٌ حَسَنٌ)) صحيح الجامع (١٣٥).

واتـە: قورسـترین شـت لـە میزانـی حەسـەناتی مـرۆڤ لـە ڕۆژی دوایـدا خوڕەوشت وئاكاری جوانە.

هەر بۆیە خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا وەسفی پێغەمبـەر ﷺ دەكات بەوەی كە خاوەنی جوانترین خوڕەوشتی بەرزە ﴿وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ سورەتی قەلەم:( ٤).

بـەكورتی ئەگـەر پیاوێـك خـاوەنی دیـن وڕەوشـت بـوو نوێـژ و ڕۆژوو و بەندایەتی دەكرد بۆ خوا گەورە و داوێن پیس و عەرەق خۆرو قومارچـی و نێرگەلە كێش حەب خـۆر نـەبوو،كەسـێكی زمـان پـاكو نـەرمو نیـان و ڕەوشـت بـەرز و خـاوەن ئوسـلوب و هەڵسـوكەوتی جـوان بـوو لـە گـەڵ خەڵكدا و ڕێزی لە بەرامبەری خۆی دەگرت ئەوا ژنـی بـدەنێ،خـۆ ئەگـەر ئاوا نەبوو نابێـت ژنـی بـدرێتێ ئـیتر بـا دەوڵەمەنـد وسـەرمایەداربێ یـان خاوەن بنەماڵەو پێگەی بەهێزی كۆمەڵایەتی بێ و بابو باپیرانی كەسانی باش وخواناس بن چونكە ئەو كچە دەبێتە خێزانـی ئـەو كـوڕە خراپـە و

**باوك و كەسوكار سودی بۆ ئەو كورە لاسارە نابێت بەڵكو پێویستە خودی ئەو گەنجە خۆی كەسێكی ڕەوشت بەرز و خاوەن دین بێت.**



# ئەو هەڵانەی لە كاتی بەشودانی كچاندا دووبارە دەبنەوە

**هەندێك لەم هەلآنەی كە زۆر جار دووبارە دەبنەوە:**

**١/ بەداخەوە ئەوندە بایەخ بـە دەوڵەمەنـدی خانـەوادە و كـەس وكـاری كوڕەكە دەدرێـت ئەوەنـدە بایـەخ بـەدین و ڕەوشـتی نادرێـت،مەبەسـت ئەوەنییە كەحیساب بۆ چاكی باوك ودایك و بنەماڵەكـەی نـەكرێت بـەڵكو مەبەستەكە ئەوەیە خاڵی یەكەم تۆلە چاكی كورەكەوە دەست پـیٚ بكـە پاشان پرسیاری خانەوادەكـە شـی بكـە.... نـەك هـەموو بایـەخێكی تـۆ بۆدۆزینەوەی بنەماڵەیەكی دەوڵەمەند و نـاودار و ناسـراو دەسـلأتداربێت ئیتر باكوڕەكەشیان بەكەڵكی هیچ نەیەت.**

**٢/ زۆرجار خاوەن كچ بیانوی كارو ئیشی باش یان وەزیفـە و شـەهادەی بەرز دەگرن ئەگەر كوڕەكە ئەمانەی تیـادا بـوو دەسـت بـەجیٚ داواكـەی وەرگیراوە و كچەكەی دەدەنیٚ بەلاٚم ئەگەر بە پێچەوانەوە بـوو ئـیتر لـە دین و ڕەوشتی ناپرسن و دەست بەڕوویەوە دەنێن وهیچ حیسابێكی بـۆ ناكەن.**

**٣/ ناوچە گەرێتی و بنەماڵە چێتی بۆ نمونە ئەگەر بنەماڵەی كچەكە ئاغا یان شیخ یان سـەید بـن كـچ نـادەن بـە خـەڵكی ئاسـایی چـونكە بـەلای ئەوانەوە بەهاوشانی خۆیـانی نـازانن ئەمـەش بووەتـە هـۆی ئـەوەی كـە كچانێكی زۆر قەیرە ببن و پەلكی سپی بهۆننەوە، ئـەو هاوشـانییەی كـە**

**لــە شــەرعدا جێگــەی ئیعتبــارە تــەنها دینــداری ورەوشــت بەرزییــە وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە، بە بەڵگەی ئەوەی کە پێغەمبــەر ﷺ زەینــەبی پــورزای خــۆی مــارەکرد لــە زەیــدی کــوڕی حاریســە کەعەبــد بــووە لــە هەمانکاتدا زەینەب ئازادە و قورەیشیە و پورزای پێغەمبەرە ﷺ.**

**✍دیســان فاتمــەی کچــی قــەیس دوو پیــاوی قورەیشــی نــاودار لــە دوو بنەماڵەی گەورەی قورەیش داوایان کرد پێغەمبەر ﷺ فــەرمووی: شــوو بە هیچ کامیان مەکە شووی بە ئوسامەی کوڕی زەید بکە.**

**دەبینین پێغەمبەر ﷺ نە بنەماڵە و نە حەسەب و نەسەبی نەخوێندەوە تەنها ئەوەی خوێندەوە کە ئەو دوو موسڵمانە ئوسامەی کوڕی زەیـد لـە گەڵ زەیدی کوڕی حاریسە خاوەن دین و ڕەوشتی بـەرزن،لـە بـەر ئـەوە ئامۆژگاریمان بۆ هەموو خاوەن کچەکان ئەوەیە ئەو کەسەی کە خاوەنی دیــن و ئەخلاقــە و دێتــە داخــوازی کچــەکەت ئــیتر بیــانووی لــێ مــەدۆزەرەوە،ئەمــە کــەس نایناســێ بنەماڵەکــەی وا گــەورە نیــە، وا دەوڵەمەنـد نیـە ئـەو جـۆرە شـتانە مەخوێننـەوە مـادەم خـاوەن دیـن وئەخلاقە و لە خوا دەترسێ وە لە حەرام وتاوان خـۆی دەپـارێزێ ئەمـە بەسە بۆ ئەوەی ژنی بدرێتێ ئیتر پێویست بەوە ناکات زۆر خـوری ومـوو شــی بکرێتــەوە و تــوانج وتەشــەر لــە بنەماڵــەو خانەوادەکــەی بــدرێت، پێویســتە پەشــیمان بینــەوە ودەســت لــەم جــۆرە کردارانــە هــەڵبگرین،**

چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((أَرْبَعٌ فِي أُمَّتِي مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ لَا يَتْرُكُونَهُنَّ: الْفَخْرُ فِي الْأَحْسَابِ ، وَالطَّعْنُ فِي الْأَنْسَابِ ، وَالْاسْتِسْقَاءُ بِالنُّجُومِ ، وَالنِّيَاحَةُ )) ئیمامی موسلیم گێڕاویەتییەوە.

واتە: چوارشت هەن لە ناو ئوممەتەکەمدا کارو باری سەردەمی نەفامین و زۆربەی خەڵك وازیان لێ ناهێنن:

یەکەم: (( الْفَخْرُ فِى الأَحْسَابِ )) واتە: شانازی کردن بە باب و باپیرانەوە،خۆت بە گەورە نیشان بدەیت وخەڵکیش بەهەژار و داماو ودەستەمۆ بزانی.

دووەم: ((وَالطَّعْنُ فِى الأَنْسَابِ )) واتە: توانج و تەشەردان لە حەسەب و نەسەبی خەڵك و بە بێنرخ زانینیان.

سێهەم: ((وَالاِسْتِسْقَاءُ بِالنُّجُومِ)) واتە: باران ئەدەنە پاڵ بورج و ئەستێرەکان نایدەنە پاڵ دەسەڵاتی خوای پەروەردگار.

چوارەم:(( وَالنِّيَاحَةُ )) واتە: شین و وا وەیلا کردن و لە خۆدان و قژ بڕین و ڕوومەت ڕنینەوە و سنگ دادڕین لە سەر مردووەکان هەموو ئەمانە بەسیفەتی سەردەمی نەفامی دادەنرێن.

مەبەستمان ئەوەبوو شانازی کردن بەحەسەب و نەسەبی خۆتەوە وتانە و تەشەردان لە حەسەب ونەسەبی خەڵك سیفەتێکە لە سیفەتەکانی سەردەمی نەفامی هەر بۆیە پێویستە هەمومان خۆمانی لێبپارێزین.

# بەشی سێهەم

# ئادابەکانی داخوازی کردنی ئافرەتان

سەرەتا پێویستە ئەوە بزانین کاتێك ئیسلام گرنگی داوە بە درووست کردنی خێزان و پێکەوەنانی ماڵ، هەموو ئاداب وحوکمەکانیشی بە شێوازێکی تێر و تەسەل بۆ دیاری کردووە بۆئەوەی دووچاری هەڵە نەبین تیایدا.

چۆن بچیتە خوازبێنی ئەو ئافرەتەی کە دەتەوێ بیکەیتە هاوسەری ژیانت، بیکەیتە دایکی منداڵەکانت، بیکەیتە شوێنی پاراستنی نهێنییەکانی ژیانت و متمانەی پێبکەیت کەعەیبەکانت بۆ دابپۆشێ،کاتێك تۆ لەماڵەوە نەبویت سەروەت وسامان وکەسایەتیت بپارێزێت،وەکاتێکیش لەماڵەوە بویت کۆمەکیکار و یارمەتی دەرت بێ بۆ هەموو کار و کردەوەیەکی باش.

لەئادابەکانی خوازبێنیکردنی کچان سەیرکردنی ئەو کچەیە کە دەتەوێت بچیتە خوازبێنیکردنی وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( إِذَا أَلْقَى اللَّهُ فِى قَلْبِ رَجُلٍ خِطْبَةَ امْرَأَةٍ فَلاَ بَأْسَ أَنْ يَنْظُرَ إِلَيْهَا )) السلسلة الصحيحة(٩٧).

هەر کاتێك خوای پەروەردگار خۆشەویستی ئافرەتێکی خستە دڵی پیاوێکەوە و ویستی خوازبێنی بکات درووستە بابچێت سەیری بکات.

وە هەروەها موغیرەی کوڕی شوعبە فەرمووی: هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و پێم ووت: من ئەمەوێ داوای ئافرەتێك بکەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (( اذْهَبْ فَانْظُرْ إِلَيْهَا فَإِنَّهُ أَحْرَى أَنْ يُؤْدَمَ بَيْنَكُمَا)) السلسلة الصحيحة(٩٦).

واتە: بڕۆ سەیری ئەوئافرەتە بکە بەڕاستی لایەق تر و شیاوترە ئەم سەیرکردنە ببێتە هۆی ئەوەی کە خۆشەویستی و میهرەبانی زیاتر لە نێوانتاندا دروست ببێ.

وە بەهەمان شێوە ئافرەتانیش ئازادی تەواویان هەیە لە بڕیاری شوکردن وشونەکردنیان بەهەر کەسێك کە هاتە خوازبێنیان و باوك و برا تاوانبار دەبن ئەگەر ببنە ڕێگر لە شوو کردنیان بەو مەرجە ئەو کەسە کەسێکی چاك وخاوەن دین و ڕەوشت بەرز بێت، لێرەدا حیکمەتی سەیرکردنی کوڕ وکچ بۆ ئەوەیە کە هەر دوولا لەسەر چاو ڕۆشنی بەیەك بگەن و لە ئەنجامدا ناخۆشی لە نێوانیاندا درووست نەبێ بەهۆی یەك نەبینینیانەوە.

کەواتە: ئەو سەیرکردنەی کە بە مەبەستی خوازبێنیکردن بیٚ شەرع ڕێگەی پێداوە بەنیسبەت کوڕو کچەوە لەو کاتەوە کە بڕیاری ژن هێنان و شوکردنیانداوە، بەلاّم ئەگەر بڕیاریان نەداوە لەو حالّەتەدا ژن بێنن یان شوبکەن سەیرکردنی هیچ کامیان بە شەرعی دانانرێت و بەڵکو پێویستە چاوی خۆیان دابخەن، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری عەلی کوڕی ئەبو تالیبی کرد و پێی فەرمووی:(( يَا عَلِيُّ لاَ تُتْبِعِ النَّظْرَةَ النَّظْرَةَ فَإِنَّ لَكَ الأُولَى وَلَيْسَتْ لَكَ الآخِرَةُ )) صَحِيحُ التَّرْغِيب وَالتَّرْهِيب ( ١٩٠٣).

واتە: ئەی عەلی جار لەدوای جار سەیری ئافرەتان مەکە و دووبارە چاومەگێڕە بەشوێنیاندا،چونکە جاری یەکەم تاوانبار نابیت بەلاّم جاری دووهەم کەچاوت گێڕایەوە سەری تاوانباردەبیت.

پاشان ڕێگەت پیٚ نەدراوە بە کەیفی خۆت سەیری هەموو ئافرەتێك بکەیت تەنها درووستە سەیری ئەوانە بکەیت کە کاتی شووکردنیان بیٚ وخێزانی کەسی تر نەبن نەك چاو ببڕیتە ئەو ئافرەتانەی کەخاوەن مێردن یان کاتی شوکردنیان نییە.

ئەو ئاداب و ئوسلوبانەی کە ئەمڕۆ کوڕان و کچان فێری بوون هەر لە قۆناغی ناوەندی و دوا ناوەندیەوە هەتا پەیمانگاو زانکۆکان هەولّی

درووستكردنی پەیوەندی خۆشەویستی دەدەن و چەندین ساڵ سەرقاڵی نامە و تەلەفۆن سەفەر كردنن بە یەكەوە بە بیانووی ئەوەی كە گەنجن با لە یەك تێبگەن!

بێگومان ئەمە كارێكی حەرامە و كوڕان دەتوانن لە ڕێگەی خوشك ودایك وئافرەتە نزیكەكانی خۆیانەوە ئەو كچە هەڵسەنگێنن ئاخۆ بە كەڵكیان دێ یان نا،بە هەمان شێوە كەسوكاری كچیش دەتوانن لە ڕێگەی كوڕو براو هاوڕێكانیانەوە ئەو كوڕە هەڵسەنگێنن كە كوڕی چاكە یان نا،ئیتر پێویست بەم ڕێگە حەرامە ناكات كە چەندین كار و كردەوەی حەرامی لێدەكەوێتەوە لە ئەنجامی دووركەوتنەوە و تاك بونەوەیان لەخەڵك.

بەڕاستی ئەم جۆرە ئاداب و ئوسلوبانە نامۆن بەم گەل ونیشتمانە ولە وولآتی بێباوەڕانەوە گوێزراوەتەوە ناومان و بێگومان ئەمە هۆكاری درووستبوون و بڵاو بوونەوەی بەدڕەوشتییە و پێویستە كوڕان وكچان بەم وەسوەسە شەیتانییە فریو نەخۆن و نامەی كردەوەكانیان بەتاوان ڕەش نەكەنەوە خۆ گەر ووشیار نەبن دواتر لەزەلكاوی داوێن پیسیداخۆیان دەبیننەوە و كەس نایان گرێتەخۆ.

**كەواتە: ئەوەندە ڕێگەت پێدراوە ئەو ڕۆژەی بڕیاری ژنهێنانتدا درووستە بگەڕێیت بە شوێن كچێكی ڕەوشت بەرز و داپۆشراودا وچاوتان بە یـەكتر بكـەوێت،ئەگـەر بەیـەك ڕازی بـوون بچـیتە خـوازبێنیكردنی پاشـان كـە وەعدیان پێدایت كچەكەت بدەنێ پێویستە پەلەبكەیت لـە مـارەكردنی و زۆر دوای نەخــەیت چـونكە هــەتا گرێبەسـتی مــارەكردنی بۆنەكــەیت قســەكردن و دانیشــتن و تەوقــەكردن و ســەفەركردن .......بەحــەرام دادەنرێت.**



# ترسـناکی خـەڵوەتی حـەرام و تەوقـە کـردن لەگـەڵ ئافرەتانی نامەحرەمدا

ئەوعادەتەی هەتا ئێستا لای هەندێك خـەڵك هـەرماوە پـێش مـارەکردنی کچ چەند مانگ و سالێ بەیەکەوە دەبن و دەچنە سەیران و بـەردەوام سـەرقاڵی گفتوگـۆکردنن لەگـەڵ یـەکتردا ئەمـە دەچـێتە چوارچـێوەی خەڵوەتی حەرامەوە وەك پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلَا يَخْلُوَنَّ بِامْرَأَةٍ لَيْسَ مَعَهَا ذُو مَحْرَمٍ مِنْهَا فَإِنَّ ثَالِثَهُمَا الشَّيْطَانُ} صَحِيح التَّرْغِيبِ وَالتَّرْهِيب:(١٧٢,١٩٠٩).

واتە: هەر کەسـێك بـڕوای بـە خـوا و بـە ڕۆژی دوایـی هەیـە بـا لـە گـەڵ ئافرەتێکدا بە تەنها نەمێنێتەوە کـە مـەحرەمی لـە گەڵدا نـەبێت ئـەوان دووانن و سێیەمیان شەیتانە .

بەڵام ئەگەر باوك و برای خۆی لە گەڵدا بـوو درووسـتە لـە شـوێنێکدا بـە یەکەوە دابنیشن وگفتوگۆ لەگەڵ یەکتردا بکەن و لە یەکتر حاڵی ببن.

یەکێك لەو حاڵەتانەی کە خەڵك زۆر گوێی پێنادەن مانەوەو دانیشتنە چ بەتەنها یان بەتێکەڵی لە گەڵ کچانی مام وخاڵ و پورەکان یان خوشـکی خێزان و هەتا کۆتای.......

وەك لە فەرمودەکەدا هـاتووە ئـەوان دووانـن وسـێیەمیان شـەیتانە خـۆ ئیتر ئاشکرایە ئەگـەر سـێهەم شـەیتان بـوو چـی ڕوو دەدات لـە گونـاهو

تاوان و خراپەکاری و ئەوەی ئەبێتە هـۆی دڵتـەنگی و سـەر شـۆڕی ئـەو هەموو خزم و کەس وکارە.

هەر بۆیە پێویستە مرۆڤی بڕوادار ئاگای لە ماڵ و منداڵ و خێزانی خـۆی بێ وکەسێکی غافڵ وبێئاگا نەبێ لەوەی کە دەگـوزەرێ لـە دەوروبـەری ئەمـە مانـای خانـەگومانی نییـە بـەڵکو پاراسـتنی شـەرەف و ناموسـی خانەوادەکەت لە سەر تۆ واجبە وئەمەش ئـەرکێکی ئاینییـە، بـە ووتـەی ئـەو گورگانـە فریـو نـەخۆیت کـە بەشـوێن نێچـیرێکی چـەوردا دەگـەڕێن ودەڵێن: ئێمـە دڵمـان پاکـە و وەك خوشـك وبـرا لەگـەڵ یـەکتردا هەڵسـو کەوت دەکەین.

چونکە پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیەکدا فەرموویـەتی:(( إِيَّـاكُمْ وَالـدُّخُولَ عَلَى النِّسَاءِ )) واتە: ئەتان ترسێنم لەوەی کە بەتەنها لەگەڵ ئافرەتانـدا کۆببنەوە (( فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ الْأَنْصَارِ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَرَأَيْـتَ الْحَمْـوَ)) پیاوێـك لـە پشـتیوانان ووتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئەگـەر ئافرەتێـك بمێنێتەوە لە گەڵ خزمی مێردەکەیدا ـ وەك براو ئامۆزاو خـاڵۆزاو پـورزا و خوشکەزای مێردەکەی ـ ئایا درووسـتە؟ ئـەویش فـەرمووی: ((الْحَمْـوُ الْمَوْتُ))مردن باشترە لە مانـەوەی ئـافرەت لـە گـەڵ خزمـی مێردەکـەی بەتەنها، بۆ؟ چونکە کەس گومانی خراپیـان پێنابـات و ناترسـن لـەوەی کە خەڵك چاوی لەسەریان بێت و ئاشکرابن ئەمەش ئەبێتە هۆی ڕودانی

**کارەساتی زۆر گەورە هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مردن باشترە.**

**لە پاشان پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکی تردا ئاماژە بۆ خاڵێکی تر دەکات ئەویش تەوقە کردنە لە گەڵ ئافرەتانی نامەحرەم ،وەك کچانی مام وخاڵ وپورەکان یان خوشکی خێزان یان ئەو ئافرەتەی کە بەڵێنیان پێداوی و هێشتا مارەت نەبڕیوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( لَأَنْ يُطْعَنَ فِي رَأسِ رَجُلٍ بِمِخْيَطٍ مِنْ حَدِيدٍ ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمَسَّ امْرَأَةً لَا تَحِلُّ لَهُ** )) الصَّحِيحَة:( ٢٢٦).

**واتە: بەڕاستی ئەگەر یەکێك لە ئێوە بە دەرزی ئاسن لە سەری بدرێ هێشتا بۆ ئەو باشترە لەوەی کە دەستی بەر دەستی ئافرەتێکی نامەحرەم بکەوێ.**

**وە ئەوکەسانەش کە پێیان وایە تەوقەکردن دروستە لەگەڵ ئافرەتاندا بە هەڵەداچوون چونکە فەتواکەیان پێچەوانەی فەتوای پێغەمبەری خۆشەویستە ﷺ .**

# پرس و ڕاوێژ

پێویستەکاتێك کوڕێـك ئەیـەوێت داخـوازی کچـێك بکـات یـان کچـێك خـوازبێنی کـراوە لەلایـەن کوڕێکـەوە پـرس وڕاوێـژ بکـات بەکەسـانی متمانـەدار و لـە کەسـایەتی و ڕەوشـت و ئاکـاری یـەکتر بکۆڵنـەوە،لـەم حاڵەتەشدا واجبە لەسەر ئەو کەسەی کـە پـرس و ڕاوێـژی پـێ دەکرێـت ئەوەی کە دەیزانێ لەعەیب و کەم و کورتی کچەکە یان کوڕەکـە بیخاتـە ڕوو،وە ئەمە بە غەیبەت دانانرێت چونکە فاتمەی کچـی قـەیس هـات بـۆ لای پێغەمبـەر ﷺووتـی: ئـەی پێغەمبـەر ﷺ دوو پیـاو هاتوونەتـە خوازبێنیم یەکێکیان ئەبوجەهمە و ئەویتریان معاویەیە (خوایان لـێ ڕازی بێ ) دوو صەحابی بوون ، منیش ئەمـەوێ شـوو بـە یـەکێك لـەم دووانـە بکەم تۆ ئەڵێی چی؟ پێغەمبەر ﷺ لەبارەی ئەبو جەهمەوە فەرمووی: (( لَا يَضَعُ عَصَاهُ عَنْ عَاتِقِهِ )) ئەبو جەهم پیاوێکـە گۆچـانەکەی لـە سـەر ملی داناگرێ ، کینایەتە لەوەی کە پیاوێکە زۆر سەفەر دەکات و کەم لە ماڵەوەیـە یـان پیـاوێکی تونـدە بەرامبـەر ژن ،پاشـان پێغەمبـەر ﷺ لەبارەی کەسی دووهەمەوە فەرمووی: ((أَمَّا مُعَاوِيَةُ فَعَائِلٌ لَا مَالَ لَهُ )) الجامع الصحيح للسنن والمسانيد(٣٥/ ٣٣٧).

واتە:موعاویەش پیاوێکی هەژارە و هیچ مـاڵ و سـەروەت و سـامانی نیـە بەڵام شوو بکە بە ئوسامەی کوڕی زەید، پێغەمبەرﷺ پیاوی سێیەمی بۆ دەست نیشان کرد.

مەبەستمان لێرە ئەمەیە خۆ ئەگەر ئەمە غەیبەت بوایە پێغەمبەر ﷺ ئەم قسانەی نەدەکرد، مادام پرس و ڕاوێژیان پێ کردیت حەق بڵێ وە ئەمە واجبە لە سەرت خۆ ئەگەر نەیلێیت گوناهبار دەبیت.

✍ خاڵێکی تر لە سەر ئادابەکانی داخوازی ئەوەیە کە ئەگەر داخوازی ئافرەتێك کرا و وەعد بە کابرا درا کە ئەو کچەی بدەنێ درووست نیە و حەرامە بۆ کەسێکی تر بچێتە داخوازی ئەو ئافرەتە ئەمەش وەك مامەڵە کردن وایە لە سەر مامەڵەی کەسێکی تر وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( وَلا يَخْطُبُ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ حَتَّى يَتْرُكَ الْخَاطِبُ قَبْلَهُ أَوْ يَأْذَنَ لَهُ الْخَاطِبُ )) الجامع الصحيح للسنن والمسانيد(٣٣/ ٣١٧).

واتە: با هیچ یەکێك لە ئێوە نەچێتە داخوازی ئافرەتێك کە موسڵمانێکی تر پێش ئەو چووەتە داخوازی هەتاوەکو کابرا دەستی لێ هەڵدەگرێت یان ڕوخسەتی پێ دەدات.

بێگومان ئەمە بەکارێکی حەرام دادەنرێت و دەبێتە هۆی دروست بوونی ڕق و قین لە نێوان موسڵماناندا بۆیە دەڵێین: کاری وامەکە و حەرامە چاوەڕێ بکە یان ئەوەتانێ کچەکەی دەدەنێ یان ئەوەتانێ ئیزنی دەدەن و تۆ دەتوانیت بچیتە پێشەوە.

**بەکورتی: ئادابەکانی داخوازی کچان بریتین لەمانەی خوارەوە:**

**یەکەم/ سەیر کردن.**

**دوەم/ پرس وڕاوێژکردن بە کەسانی متمانە پێکراو.**

**سێیەم/ ناچیتە داخوازی ئافرەتێك کە داخوازی کراوە لەلایەن کەسێکی ترەوە هەتا یەك لایی دەبێتەوە و کابرا دەگەڕێتە دواوە.**



# بەشی چوارەم

## باسی مارەکردنی ئافرەتان و ئەو باس و خواستانەی کــە پەیوەندیدارن بەم بابەتەوە.

ئاشکرایە کە هەر بەندایەتیەك لە ئیسلامدا ئەنجام دەدریٚ کۆمەڵێك ڕوکن و مەرجی بـۆ دانـراوە خـۆ ئەگـەر ئـەو مـەرج و ڕوکنانـە نەیەنـەجیٚ ئـەو بەندایەتیە بە بەتاڵ و بە فاسد دادەنریٚ.

مارەکردنی ئافرەتان بەم دوو ڕوکنە دادەمەزرێت کە بریتییە لە ئیجاب و قەبوول لە نێوانی باوك یان وەلی ئەمری کچەکە لەگەڵ (زاوا)ئەو کەسەی کە هاتووە بۆ خواز بێنی کچەکە،پاشان بەمەرج گیراوە بۆ درووسـتیەتی ئــەم نیکاحــە ڕوخســەت دان و مۆڵــەت دانــی وەلــی ئــەمر لــە گــەڵ ئامادەبوونی دووشایەت لە دانیشتنی گـریٚ بەسـتی مارەبڕینەکـەدا،وەك پێغەمبەر صلی الله علیەوسـلم فەرمویـەتی:(( لَا نِكَاحَ إِلَّا بِوَلِيٍّ وَشَاهِدَيْ عَدْلٍ، وَمَا كَانَ مِنْ نِكَاحٍ عَلَى غَيْرِ ذَلِكَ فَهُوَ بَاطِلٌ....))صَحِيح الْجَامِع:(٧٥٥٧).

واتــە:هــیچ مارەبڕینێـك دانامــەزرێت بــەبیٚ مۆڵەتـدانی وەلی ئەمرەکـەی و ئامادەبونی دووشایەتی دادپەروەر، هەر مـارە بڕینێـك پێچـەوانەی ئەمـە بێت بە بەتاڵ دادەنرێت.

مەرجی یەكەم/ ئەگەر ئافرەتانێك یان كچانێك سەربەخۆ شوو بكەن بەبێ وەلی ئەمر ئەمە بە مارەبڕینێكی بەتاڵ دادەنرێت چونكە خوای پەروەردگار لە قورئاندا فەرموویەتی: ﴿فَانكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ﴾سورەتی نساء : (٢٥).

واتە: كچان و ژنان مارە بكەن بە ئیزنی وەلی ئەمرەكانیان وەك باوك و براو.....

خۆ ئەگەر بێتوو ئیزنی وەلی ئەمری لە سەر نەبێ ئەو نیكاحە بە بەتاڵ دادەنرێت لە شەریعەتی ئیسلامدا وەك خاتوو عائیشە دایكی ئیماندارنا بۆمان ئەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( أَيُّمَا امْرَأَةٍ لَمْ يُنْكِحْهَا الْوَلِيُّ فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ )) صحيح سنن ابن ماجة: ١٨٧٩).

واتە: هەر ئافرەتێك كە وەلی ئەمرەكەی بە شووی نەدا سەربەخۆ شووبكات یان بەبێ ئیزنی وەلی كەسێكی تر لە خۆیەوە بەشووی بدات، ئەوە نیكاحەكەی بەتاڵە نیكاحەكەی بەتاڵە.

كەواتە: پێویستە دایكان و خوشكان ئاگادار بن كە خەڵكانێكی فێڵ باز فریویان نەدەن و خۆیان بكەنە وەلی ئەمریان و بەدزیی باوك و برایانەوە

لە خۆیان یان لە خەڵكیان مارە بكەن چونكە بەبێ وەلی ئەمر مـارەبڕین دانامەزرێت خۆ ئەگەر وەلی ئەمر خۆشی ئامادە نـەبوو ئـەوا پـێ ویسـتە وەكیلێك دابنێ بۆئەوەی كارەكەی بۆ ڕای بكات.

خاڵی دووەم/ بریتی یە لە هـەبوونی دوشـایەتی دادپـەروەر كـە شـایەتی بدەن ئەو كچـە مـارە كـراوە لـە فـلان كـەس چـونكە ئەگـەر شـایەت لـە نێوانیاندا نەبێ كە لە پێش چاوی عەقـدی نیكـاح و گـرێ بەسـتی زەواج كرابێ ئەوە هـەروەك دەبێتـە جێگـەی گومـانی خـراپ و شـەرمەزاری لـە نێوان خەڵكدا لەڕوی شەرعیشەوە دانامەزرێت.

هەڵبەتە كەسی دادپەروەر بریتی یە لـەو پیـاوەی كـە گونـاهی گـەورەی ئەنجام نەدابێت و بەردەوامیش نەبوبێت لە سەر گونـاهی بچـووك، ئەمـە بەدادپەروەر دادەنرێت لە شەریعەتی ئیسلامدا .

خۆ ئەگەر ئافرەتێك شوو بكـات و لـە هەمانكاتـدا دوو شـایەت نـەبن كـە شایەتی بـدەن ئـەو كچـە شـووی كـردووە بـە فـلان كـەس بەشـێوازێكی شەرعی ولە مەجلیسی گرێ بەسـتی مارەبڕینەكەشـدا ئامـادە بـوبن ئـەو نیكاحە بەنیكاحێكی شەرعی دانانرێت.

بەكورتی: ئەم دوو مەرجە ڕەزامەندی وەلی ئەمر و هەبوونی دوو شایەت پێویستە هەبن لە گەڵ دوو ڕوكنی ئیجاب و قەبووڵ ئەوكاتە بەمارەبڕینێكی شەرعی دادەنرێت.

## لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە:

ئایا وەلی ئەمر بۆی هەیە بەبێ پرس و ڕاوێژ پێ كردن یەكسەر كچەكەی یان خوشكەكەی بە شوو بدات و هیچ حیسابێكیان بۆ نەكات؟

وەڵام:لەڕوی شەرعییەوە نابێت وەلی ئەمر بەبێ پرس و ڕاوێژ كچەكەی یان خوشكەكەی بدات بەشوو وەك عبدالله ی كوڕی عەباس بۆمان دەگێڕێتەوە كە كچێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وپێی ووت :(( انَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهِيَ كَارِهَةٌ قَالَ فَخَيَّرَهَا النَّبِيُّ ﷺ)) الجامع الصحيح للسنن والمسانيد(٣٤/ ٤٧٥).

واتە: باوكی ئەو ئافرەتە ئەو كچەی بە زۆر داوە بەشوو وە ئافرەتەكەش ناڕازی یە، پێغەمبەر ﷺ ئافرەتەكەی سەرپشك كرد:ئەگەر ئەتەوێ ئەو نیكاحە سەر بگرێ ئەوا ڕازی بە وە ئەگەر ناتەوێ هەڵیوەشێنەرەوە، پێغەمبەری خودا ﷺ حەقی دا بەم ئافرەتە كە دەتوانێت نیكاحەكەی هەڵوەشێنێتەوە،بەڵام دواتر ئافرەتەكە خۆی ڕازی بو بە كارەكەی باوكی هەڵی نەوەشاندەوە.

**هەروەها خەنسای ئەنصاری (خوای لیٚ ڕازی بیٚ) باوكی بەزۆر دابووی بە كابرایەك دیسان پێغەمبەرﷺ سەرپشكی كرد.**

**كەواتە:پێغەمبەر ﷺ لە زەمانی خۆی ئەوەی ڕەدكردووەتەوە كە وەلی ئەمر بە زۆر كچەكەی خۆی بە شوو بدات و پرس و ڕاوێژی پیٚ نەكات وە ئەم كارەی بە پێچەوانەی شەرع داناوە هەر بۆیە كچانی سەرپشك كردووە لە قەبوڵكردن و ڕەدكردنەوەی.**



## ئایا وەلی ئەمر بۆی هەیە ڕێگری بکات لەوەی کە کچــەکەی یان خوشکەکەی شوو نەکات بە فلان وفلان؟

وەلاَم: لـە یـەك حالَەتـدا وەلـی ئـەمر بـۆی هەیـە ڕێگـری بکـات ئـەویش ئەوەیە:

کەسێکی خراپ بێتە خوازبێنی کچەکەی که گلەی لـە ڕەوشـت و ئـاینی بکرێت وەك: ئەوەی کەسێکی نوێژنەکەر و ڕۆژو نـەگر بێـت و بەندایـەتی بۆ خوای گـەورە نـەکات یـان کەسـێکی مـەی خـۆر و موخـەدیرات کـێش وقومارچی بێت یان ناوبانگی داوێـن پیسـی وخراپـەکاری تـری هـەبێت ، لەم حالَەتـەدا وەلی ئـەمر بـۆی هەیـە ڕێگـری بکـات لـە کچـەکەی و ڕازی نەبێت کە شوو بکات بەم جۆرە کەسانە ئەمەش مایەی دلَسۆزی باوکـان و برایانە بۆ کچەکانیان و پاراستنی بەرژەوەندییەکانیانە نەك ستـەم لـێ کردنیان بۆ ئەوەی دوای دووچاری ئاژاوە و گێچەلْ نەبن و گیر نەخۆن بە دەست مرۆڤە خراپەکانەوە و سوکایەتیان پێ نەکەن.

هەر بۆیـە ئـەم بڕیـارەش دراوەتـە دەسـت پیـاوان چـونکە ئـەوان زیـاتر تێکەلاَوی کۆمەلَگە دەبن و شـتی زیـاتر دەبیـنن و دەبیسـتن و دەتـوانن

حاڵی کەسەکان باشتر هەڵبسەنگێنن بەڵام ئافرەتان زۆر حاڵی خەڵك نازانن و شارەزای ڕەوشت و هەڵسوکەوتیان نین.

ئەگەر ئەو کەسەی دێتەداخوازی کچەکەت خاوەن دین وڕەوشت بێ و کچەکەت پێی ڕازی بێ ئەوە تۆیش ڕەزامەندی بدە و بەهیچ شێوازێك ڕێگری مەکە لە شوو کردنی چونکە گوناهبار دەبیت.

خاڵی دووهەم: بریتی یە لە دانانی مارەیی بۆ ئافرەت.

هەر ئافرەتێك بە شوو بدرێ پێویستە مارەیی بۆ دیاری بکرێت،خۆ ئەگەر لە مەجلیسی مارە بڕینەکەشدا باسی مارەیی نەکرا مارەیی بۆ واجب دەبێت بە وێنەی ئافرەتانی هاوشێوە و هاوتەمەنی خۆی،پاشان مارەییش تەنها مافی ئەو ئافرەتەیە و باوك و برا ناتوانن دەستی بەسەردا بگرن.

خوای پەروەردگار لە قورئاندا فەرموویەتی: ﴿وَآتُواْ النَّسَاء صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً﴾ سورەتی نیساء.

واتە: واجبە لەسەر شانتان ئەو مارەییەی کە بڕیارتان داوە بیدەین بە خێزانەکانتان.

ئەوە قەرزێکە لە سەر شانی تۆ واجبە ئەو مارەییە بدەیتە خێزانت نەك بە کەیفی خۆت هەڵیگریتەوە یان ستەمی لێ بکەیت و لێی کەم کەیتەوە ئەمانە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامە ئەو مارەییە مولّکی ئەو ئافرەتەیە، ئیلا مەگەر شتێك بە وویست و ڕەزامەندی خۆی بیبەخشێتە باوکی یان برای یان مێردی بەڵام ئەبێ ڕەچاوی ئەوەش بکرێ کە ئەو ئافرەتە نەکەوێتە ناو ڕووەوە و لە ڕوو دانەمێنێ کە باوکی یان برای داوای لێ بکەن ئەویش شەرم بکات لەوەی کە نەیان داتێ ئەوە دووبارە ئەچێتە چوارچێوەی حەرامەوە.



# ئایا لە ئیسلامدا كەمی و زۆری مارەیی دیاری كـراوە یـان بەپێی ڕێككەوتنی مرۆڤەكانە؟

لە ئیسلامدا كەم و زۆری مارەیی دیـاری نـەكراوە بـەڵام پێغەمبـەر ﷺ هانی موسڵمانانی داوە كە هـەتامارەیی كـەمتربێ خێردارتـر و بەرەكـەت دار ترە وەك فەرموویەتی: (( خَيْرُ الصَّدَاقِ أَيْسَرُهُ ))صححه الألباني في الإرواء تحت حديث:(١٩٢٤).

واتە: خێردار ترین مارەیی ئەویە كە كەم بێ .

بەڕاستی زۆر جار دەبیستین گەنجانێكی هەژار و داماو كاتێك ژن دەهێنن لـە دوای پێـنج سـاڵ یـان زیـاتر هێشـتا قـەرزی ژن هێنانیـان لـە كـۆڵ نەبووەتەوە بێ گومان ئەمە جێگەی خۆی نیە و بەكارێكی باش دانانرێت با ئێمە لاسای خەڵك نەكەینـەوە وبڵـێین: كچـی فلـان كـەس بەئەوەنـدە شووی كردووە، یان لە عورفدا وایە پێویستە ئەوەندە مسـقاڵ بـێ ئـەبێ تۆش لەوە كەمتر نەبێ، چونكە دانانی مارەیی بەڕێكـەوتن و ڕەزامەنـدی كچەكەیە ڕەوا نییە براو كەس و كار بیانو بگرن و باری شانی زاوا قورس بكەن.

كەواتـــە:كـــەم و زۆری مـــارەیی دیـــاریی نـــەكراوە لـــە شـــەریعەتی ئیسلامدا،بەڵام باشتر وایە مارەیی كەم بێ لە بەر دوخاڵ:

**یەكەم: بۆ ئەوەی كە نەبێتە ئاستەنگ و بەربەست لە ڕووی ژن هێنـان و شوو كردن چونكە ئەگەر مارەیی زۆر دانرا و باری شانی زاوا قـورس كـرا ئیتر گەنجان ناتوانن ژن بهێنن ئەو كاتە فەسـاد و خراپـەكاری درووسـت دەبیٚ.**

**دووهەم:لە لایەكی ترەوە زۆری مارەیی دەبێتە هـۆی نـاكۆكی لـە نێـوان ژن و مێرد ئەوەندە مارەییەكەی زۆرە ڕۆژ تا ئێوارە هەوڵ دەدات كەچی ناتوانێـت قـەرزەكانی بداتـەوە سـەرەنجام خـەم وپـەژارە دایـدەگرێت و هەست بەخۆشی ژیان ناكات و زۆر نزیكە ببێتە هۆی دروستبوونی كێشە لە نێوانیاندا خۆ ئەگەر مـارەیی كـەم بـیٚ و بـاری شـانی زاوا سـوك بێـت خۆش حالٚی وئاسـودەیی باڵدەكێشـێت بەسـەر ماڵـدا و بـە بەختـەوەری دەژین.**

**پاشـان پێویسـتە ئـەوەش بـزانین كـە ژن هێنـان وشـوو كـردن تـەنها بـەمارەیی كۆتـایی نایـەت و تـەكالیفی تـری دەوێـت وەك دابـین كردنـی شوێن وكڕینی پێداویستییەكانی تری ناومال......**

**ئەگەر كچەكەی خۆتت خۆش دەویٚ بیانو مـەگرە لـە كـەس مـادام ئـەو گەنجەی هاتووەتە ماڵەكـەت خـاوەن دیـن و ئەخلاقـە و تـۆیش ئەتـەویٚ**

بیكەیتە زاوای خۆت شتێك دابنێی كە ببێتە مایەی خێر و خۆشی بۆ ژیانی كچەكەت و كوڕەكەش ، نەك ببێتە مایەی ناخۆشی و خەم و خەفەت و بێ تاقەتی چونكە زۆر خەڵكێك هەن چەندین ساڵە دەناڵێنن بەدەست قەرزی زەمانی ژن هێنانەوە.

سەهلی كوڕی سعد بۆمان دەگێڕێتەوە كە ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوو لە ناو هەندێك لە صەحابەكاندا و ئافرەتێك هاتە بەردەم پێغەمبەر ﷺ و ووتی: (( إِنِّي قَدْ وَهَبْتُ نَفْسِي لَكَ )) واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ من خۆم بە تۆ بەخشی بەبێ بەرامبەر(( فَقَامَتْ قِيَامًا طَوِيلاً )) ماوەیەك بە پێوە ڕاوەستا ،بەلاّم دیار بوو كە پێغەمبەر ﷺ خواستی ژن هێنانی نەبوو لەو حاڵەتەدا،هەر بۆیە وەلاّمی نەدایەوە و بێ دەنگ بوو ئەمەش بەڵگە بوو لە سەر ئەوەی كە پێغەمبەر ﷺ نایەوێ ژن بێنێت،پاشان یەكێك لە یاران هەستایە سەر پێ و فەرمووی:(( يَا رَسُولَ اللَّهِ زَوِّجْنِيهَا إِنْ لَمْ يَكُنْ لَكَ بِهَا حَاجَةٌ )) واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەو ئافرەتە لە من نیكاح بكە ئەگەر تۆ خۆت پێویستیت پێی نیە ،پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (( هَلْ عِنْدَكَ مِنْ شَيْءٍ تُصْدِقُهَا إِيَّاهُ )) واتە: ئایا تۆ شتێكت هەیە كە بیكەیت بە مارەیی بۆی ،كابرا لە وەلاّمدا

فەرمووی: (( فَقَالَ : مَا عِنْدِی إلاَّ إزَارِی )) واتە:لەو پۆشاكەی كە لە بەرمدایە زیاترم نیە،پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خۆ ئەگەر پۆشاكەكەی خۆتی بدەیتێ ئەوا خۆت بەبێ پۆشاك دەمێنیتەوە، (( فَالْتَمِسْ وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ )) واتە:بڕۆ بگەڕێ شتێك بۆ خۆت پەیدا بكە ئەگەر ئەنگوستیلەیەكی ئاسنیش بێ، كابرا گەڕا بەملا ولادا بەلآم هیچ شتێكی دەست نەكەوت ناچار بە بێ دەنگی دانیشت لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ وە نەیتوانی شتێك بۆ خۆی پەیدا بكات و بیكاتە مارەیی بۆ ئەو ئافرەتە،ئەوجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (( هَلْ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ شَيْءٌ)) ئایا تۆ شتێكت لە قورئانی پیرۆز لە بەرە؟ كابرا ووتی: ((نَعَمْ سُورَةُ كَذَا وَسُورَةُ كَذَا)) فەرمووی: بەڵێ فلاَن سوورەت و فلاَن سوورەتم لە بەرە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((قَدْ زَوَّجْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ)) ئیمامی بوخاری و مسلم ڕیوایەتیان كردووە.

ئەوا ئەو كچەم لێ نیكاح كردی بەو قورئانەی كە لەبەرتە،ئەمەش باشترینی مارەیی یە بەڕاستی كە فێركردنی قورئانی پیرۆزە.

كەواتە: بەڵێ پێویستە مارەیی بوونی هەبێت باكەمیش بێ بەو مەرجە شتێك بێت سودی لێ ببینرێت چونكە كەم و زۆری مارەیی دیاری

**نەکراوە لە شەرعدا بەڵاّم هەتاوەکو کەمتر بێ باشترە بۆ ئـەوەی نەبێتـە ئاستەنگ و بەربەست لە ڕێی ژن هێنانی گەنجان.**



# ترسناكی نكوڵی كردن لە مارەیی ئافرەتان

خاڵێكی تر كە پێویستە ئاگامان لێی بێت لە كاتی دانانانی مارەیدا پێویستە ئەوەندە دابنرێت كە بتوانرێت جێ بە جێ بكرێت.

وەك دەبیستین لە هەندێك شوێن لەكاتی مارەبڕیندا سەد مسقاڵ یان دوو سەد مسقاڵ یان سەد لیرەی بۆ دادەنێن و دەڵێن بینوسە خۆكەس كیسەی بۆ هەڵنەدووریوە بەڕاستی ئەمە كارێكی ناشەرعییە چونكە زاوا بەتەمای بژاردنی نییە و پێی هەڵناسوڕێ ئیلا مەگەر لەكاتی لێكجیابونەوە بۆی بكرێتە مانگانە ئەویش خوای گەورە دەزانێت كەی تەواو دەبێ،هەندێك خەڵك وادەزانن دانانی مارەیی زۆر دەبێتە هۆی گرێدانی ئەو كچ و كوڕە بەیەكەوە و ئیتر ئەو كوڕە بەئاسانی ناتوانێت لەو ئافرەتە جیاببێتەوە خۆ ئەگەر ئەودوانە نەیانتوانی بەیەكەوە ژیان ببەنە سەر نەك سەد لیرەو دوسەد لیرە بەڵكو سەدان كیلۆ ئاڵتون خۆشەویستی ناخاتە نێوانیانەوە وسەروەت و سامان و ئاڵتوون بە یەكیانەوە گرێ ناداتەوە، درووستكردنی خێزان لەسەر بناغەی خۆشەویستی و ڕەوشت بەرزی و لێ بوردەیی و ملكەچی بۆ حوكمەكانی

**ئیسلام دەستەبەر دەبێت نەك سەروەت و سامان و خۆهەڵكێشان بەزۆری مارەیی ئافرەتانەوە.**

**وەك پێشتر ئاماژەمان پێكرد مارەیی مافی ئافرەتە و پێویستە وەك هەر قەرزێكی تر هەولبدەیت بۆ بژاردنی ،پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((** أَحَقُّ مَا أَوْفَيْتُمْ مِنْ الشُّرُوطِ أَنْ تُوفُوا بِهِ مَا اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الْفُرُوجَ**)) ئیمامی بوخاری و موسلیم گێڕاو یانەتەوە.**

**واتە: باشترین مەرجێك كە پێویست بێ لە سەرتان وەفای پێ بدەن و نەیفەوتێنن ئەو مەرجەیە كە ژنەكانتانی پێ حەلاڵ بووە.**

**مەبەستی مارەیی ئافرەتانە كە واجبە وەفای پێبكرێت و حەقی خۆیانیان پێ بدرێ چونكە ئەوە لە سەر پیاوان واجبە و قەرزێكە لە ئەستۆیاندا خۆ ئەگەر گوێی پێ نەدەن گوناهبار دەبن و لە ڕۆژی دوایدا بە زیناكار دادەنرێین وەك ئەو فەرمودەیەی كابانی كوردی بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ كە فەرموویەتی:((** أَيُّمَا رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً عَلَى مَا قَلَّ مِنَ الْمَهْرِ أَوْ كَثُرَ، لَيْسَ فِي نَفْسِهِ أَنْ يُؤَدِّيَ إِلَيْهَا حَقَّهَا ، خَدَعَهَا ، فَمَاتَ وَلَمْ يُؤَدِّ إِلَيْهَا حَقَّهَا لَقِيَ اللهَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَ هُوَ زَانٍ**))** صَحِيح التَّرْغِيبِ وَالتَّرْهِيب:( ١٨٠٧).

**واتە:هەر پیاوێك ژنێك مارە بكات لەسەر مارەییەك كەم بێت یان زۆر بەلاّم لە دلّیدا نەبێت كە مافی خۆی ـ مارەییەكەی ـ بداتێ و فریوی**

بدات، پاشان کابرا دەمرێت و هێشتا مافی ژنەکەی خۆی نەداوە کاتێك دەگاتە بەردەستی خوای گەورە لە ڕۆژی دوایدا حیسابی زیناکاری بۆدەکرێت.

ترسناکترین فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ لە سەر خواردنی مارەیی ئافرەتان پێویستە هەمووومان وریا بین و هەوڵی بژاردنی مارەییە قەرزەکان بدەین بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی ئەم سزا گەورەیە نەبینەوە.

لە پاشان خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ أَرَدتُّمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَارًا فَلاَ تَأْخُذُواْ مِنْهُ شَيْئًا... ( ٢٠ ).﴾ سورەتی نساء .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە ویستان ژنەکانتان تەلاَق بدەن ئەگەر کۆڵ و بارێکی زۆر پارە و ئاڵتوون و سامانت دابوویە لە مارەییدا هیچی لێ وەرنەگریتەوە هەمووی بدەنێ با بیبا لەگەڵ خۆی.

هەندێك جار دەبیستین کەسێك بیانو بەخێزانەکەی خۆی دەگێڕێ و دەیەوێ تەلاَقی بدات بەلاَم بۆ ئەوەی کە خێزانەکەی دەست لە مارەییەکەی خۆی هەڵبگرێت ماندو بێزاری دەکات هەتا ئەم ئافرەتە دەست لە مافی خۆی هەڵبگرێت و بڵێ : هەموو مارەییەکەم بۆ تۆ بەس با دەستم لە دەستت بێتەوە وە تەلاَقم بدە من هیچم لە تۆ ناوێ.

بێگومان ئەمە بەستەم دادەنرێت مادام تۆ دەتەوێ لە خێزانەکت جیاببیتەوە وەکو پیاو تەلاَقی بدە و هەموو مارەییەکەی بدەرێ چونکە

**شـەریعەتی ئیسـلام ئەمـەی واجـب کـردووە لـە سـەر شـانی تـۆ ئـەگینا ڕووبەڕوی سزای سەختی دواڕۆژ دەبیتەوە.**



## بەشی پێنجەم

## لەم بەشەدا بە یارمەتی خوای گەورە بە كورتی پوختـــەی كتێبی ئادابەكانی ژن هێنـــان و زەماوەنـــد بـــاس دەكـــەین دانراوی زانای گەورە و فەرمووودەناســـی ســـەردەم شـــێخ ئەلبانی ڕەحمەتی خوای گەورەی لـــێ بێـــت،بـــە هەنـــدێك دەستكارییەوە.

## ئادابەكانی ژن گواستنەوە

ئاشكرایە ژن گواستنەوە بە پێی سوننەت كۆمەڵێك ئادابی جوانی لەخۆ گرتووە كە پێویستە مرۆڤی بڕوادار ڕەچاویان بكات بۆ ئەوەی سەرەتای ژیانی لەسەر سوننەتی پێغەمبەر صلی الله علیـە وسـلم پێكـەوە بنێـت و خانەوادەیەكی شادمان و بەختەوەر دروستبكات.

١/ نواندنی نەرمی و لەسەر خۆی لەگەڵ خێزانیدا لـە شـەوی بوكێنیـدا، سوننەتە بە خواردنەوەیەك وەك شیر یان شەربەت پێشوازی لـە خێزانـی بكات كاتێك دەچێتە ژوورەوە بۆلای وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ پەرداخێك شیری پێشكەش بە خاتو عائیشەی خێزانی كرد(خوای لێ ڕازی بێ) ئەم سونەتەی پێغەمبەر ﷺ هۆكارە بۆ دروستكردنی سـۆز و خۆشەویسـتی لە نێوان پیاو ژندا.

٢/ لە شەوی گواستنەوەدا زاوا دەستی دەخاتە سەر پێشەوەی سەری خێزانی و دەڵێت : بسم الله وە دۆعای بەرەکەتی بۆ دەکات و دەڵێت:((اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا وَخَيْرَ مَا جَبَلْتَهَا عَلَيْهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَمِنْ شَرِّ مَا جَبَلْتَهَا عَلَيْهِ)) ئیمامی بوخاری و موسلیم گێڕاو یانەتەوە.

واتە:بەناوی خوای گەورە خوایە داوات لێ دەکەم لە خێرو خۆشی خێزانم بەهرە وەرم کەیت وە هەر خێر و خۆشیەك کە پەیوەستە بەو ئافرەتەوە بە نسیبی منیشی بکەیت،وە پەنات پێ دەگرم لەهەر زیان وخراپەیەکی ئەم ئافرەتە وە بەدوورم بگرە لە هەر ناخۆشیەك کە پەیوەندی دارە بەو ئافرەتەوە.

٣/ سوننەتە ژن و پیاو بەیەکەوە دوو رکات نوێژ بکەن بە جەماعەت کە پیاوەکە دەبێتە ئیمام وخێزانەکەشی لە دواوە ڕادەوەستێ ئەمە لە صەحابەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە.

و پاشان پیاوەکە ئەم دۆعایە بڵێت: ((اللهم بارك لي في أهلي وبارك لأهلي في اللهم ارزقهم مني وارزقني منهم اللهم اجمع بيننا ما جمعت في خير وفرق بيننا إذا فرقت في خير)). ئەمە لە سەلەفەوە هاتووە.اداب الزفاف.

٤/ سوننەتە کاتێك نزیك دەبێتەوە لە خێزانی بە مەبەستی جیماعکردن ئاگای لە خۆی بێ و پەلە پەل نەکات و نەشڵەژێ و بە لە سەرخۆی و

**هێمنی هەندێك خێزانی بلاوێنێتەوە و پاشان ئەم دوعایە بڵێت: ((بسم الله اللهم جنبنا الشيطان وجنب الشيطان ما رزقتنا،فإن قضى الله بينما ولدا لم يضره الشيطان أبدا)) فەرموودەكە ئیمامی بوخاری و مسلم ڕیوایەتیان كردووە.**

**واتە: بڵێ بسم الله خوایە بە دوورمان بگرە لە شەیتان وە شەیتانیش دوور بخەرەوە لەو منداڵەی كە پێمان دەبەخشی.**

**پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:هەر كەسێك ئەم دوعایەی خوێند ئەگەر خوای پەروەردگار ویستی وابوو لەو شەوەدا منداڵیان پێ ببەخشێ ئەوە هەتا هەتایە شەیتان ناتوانێ زەفەر بەو منداڵە ببات و زیانی پێ بگەیەنێت.**

**٥/ حەرامە لە دواوە بچێتە لای خێزانی یان لە كاتی سوڕی مانگانەدا جیماعی لە گەڵدا بكات وەك خوای گەورە ئاماژەی پێ كردووە و فەرموویەتی:{ وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ (٢٢٢) نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ ....( ٢٢٣) }سورەتی بەقەرە.**

**واتە:ئەی پێغەمبەر ﷺ پرسیارت لیٚ دەکەن دەربارەی سوڕی مانگانەی ئافرەتان پێیان بڵێ :ئەوە زیان و زەرەرە کەوابوو خۆتان بە دوور بگرن لە هاوسەرەکانتان کە لە و حاڵەتەدابن و نزیکیان مەکەون هەتا پاك دەبنەوە،جاکاتێك پاك و خاوێن بوونەوە و خۆیان شۆری بچنە لایان بەو شێوەیەی کە پەروەردگار فەرمانی داوە بێگومان خوای گەورە تەوبەکاران پاکانی خۆش دەوێت ئەوانەی ڕواڵەت و ناوەڕۆکیان پاکە.ژنانی هاوسەرتان کێڵگەن بۆتان و شوێنی چاندنی وەچەن ،جا بەهەر شێوەیەك دەتانەوێ تۆو بوەشێننەناو کێڵگەکەتانەوە،ئاشکرایە ئەو شوێنەی کە شوێنی چاندنی تۆوە بریتییە لەو شوێنەی کە منداڵی لیٚ پەیدا دەبێت.**

**وەهەروەها پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی:((من أتی حائضا أو امرأة في دبرها أو کاهنا فصدقه بما یقول فقد کفر بما أنزل علی محمد))** مشكاة المصابيح (٥٥١).

**واتە:هەرکەسێك بچێتە لای خێزانی لە کاتی سوڕی مانگانەدا یان لە دواوە بچێتەلای یان بچێت بۆ لای کاهینێك و بڕوای پێبکات بە ڕاستی بیٚ باوەڕ بووە بەو ئاینەی کە دابەزیوە بۆ محمد صلی الله علیەوسلم.**

**٦/ دەستنوێژ گرتنەوە لە نێوان دوو جیماعدا سوننەتە.**

کاتێك پیاو چووە لای خێزانی و پاشان ویستی دووبارە بچێتەوەلای سوننەتە دەستنوێژەکەی تازە بکاتەوە خۆ ئەگەر خۆی بشۆرێت چاکتر و پاکترە.

٧/ دروستە ژن و مێر بەیەکەوە خۆیان بشۆرن لە یەك شوێندا و جەستەی یەکتریش ببینن.

٨/ چاکتر وایە ژن ومێرد لە دوای جیماع دەست بەجێ خۆیان بشۆرن خۆ ئەگەر خۆیانیان نەشۆرد هەتا بەرەبەیان سوننەتە دەستنوێژ بگرن یان تەیموم بکەن و پاشان بچنەسەر جێگە بۆ خەوتن.

٩/ پێویستە ئەوانەی کە نەفس و هەوا زاڵ بوو بەسەریاندا و دووچاری ئەو تاوانە بوون و چونە لای خێزانیان لە کاتی سوڕی مانگانەدا تەوبە بکەن و کەفارەتێك بدەن کە بریتییە لە نیو دیناری ئاڵتونی یان دینارێکی ئاڵتونی،بە حیسابی ئەمڕۆ دەکاتە پارەی نیو مسقاڵ ئاڵتون یان یەك مسقاڵ ئاڵتون.

١٠/ پیاو لە کاتێکدا کە خێزانی لە سوڕی مانگانەدایە هەموو ئەو شتانەی کە پێشتر بۆی حەلاڵ بووە هەر بە حەلاڵی بۆی دەمێنێتەوە جگە لە جیماع.

١١/ بەلای جومهوری زانایانەوە كاتێك ئافرەت پـاك بوویـەوە لـە سـوڕی مانگانە و خۆی شۆری ئەو كاتە دروستە پیاوەكەی بچێتەلای بەڵام پێش خۆشۆرین بە حەرام دادەنرێت.

١٢/ عـەزل درووسـتە بـۆ پیـاوان بـە مەبەسـتی دوور خسـتنەوەی كـاتی حەمل هەر چـەندە باشـتر وایـە عـەزل نـەكات بـۆ ئـەوەی نـەوەی زیـاتر بخاتەوە و ئومەتی ئیسلامی پیێ زۆر تر ببیێ.

١٣/ پێویســـتە ژن و پیـــاو بـــە مەبەســـتی پاراســـتنی داوێـــن و دوور كەوتنەوەیان لە زینا و داوێن پیسی و خستنەوەی منداڵی چاك پڕۆسەی ژن هێنان و شوكردن ئەنجام بدەن.

١٤/ حەرامە ژن و پیاو نهێنی نێوانیان بـۆ خـەڵك بـاس بكـەن بەتایبـەت ئەوەی پەیوەندی بە جیماعەوە هەبێت.

١٥/ پێویستە زاوا لە دوای گواستنەوەی خێزانی وەلیمەیەك ساز بكات و موسـڵمانانی بـۆ بـانگ بكـات،وەلیمـە بریتییـە: لـەو خواردنـەی كـە زاوا درووستی دەكات لە دوای گوێزانەوەی خێزانـی و خـزم و كـەس و كـار و هاوڕێكـانی و ئـەهلی گـەڕەكی بـۆ بـانگ دەكـات ،وەك پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتی :(( إنهُ لا بُدَّ لِلْعُرْسِ مِنْ وَلِيمَةٍ)) صحيح الجامع(٢٤١٩).

واتە: بەڕاستی پێویسـتە بـۆ هـەموو زەماوەنـدێك وەلیمەیـەك خواردنێـك ساز بكرێت.

وەهەروەهاپێغەمبەر ﷺ فـەرمانی كـرد بـە عبـدالرحمنی كـوڕی عـەوف وەلیمەیەك سازبكات كاتێك كە ژنی هێناپێی فەرموو:(( أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَـاةٍ )) ئیمامی بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە .

واتە:بچۆ خواردنێك ئامادە بكە ئەگەر مەڕێكیش بێ.

ئەمە بریتی یە لە زەماوەندی حەقیقی كە خێر و خۆشی تیایە بۆ خۆت و بـۆ خـەڵكانی دەوروبەریشـت ئـەو موسـڵمانانەی كـە دێـن لـە پـاش نـان خواردن دوعای خێرت بۆ دەكەن و لە هەمان كاتیشدا سوننەتی گەورەی پێغەمبەر یشت زیندوكردوەتەوە ﷺ.

ئیسلام ڕێگەی خۆشی و شـادیەكانی لەموسـڵمانان دانەخسـتووە بـەڵام چوارچێوەی بۆ داناوە،چونكە زۆر جار دەبیستین ئەوانەی كە بێ ئاگـان لـە جـێ بـەجێ كردنـی ئـەم سـوننەتە دەچـنە هۆڵـە تایبەتـەكان یـان دەرەوەی شار و تێكەڵی لە نێوان ژنان و پیاواندا دروست دەكەن وجگـە لەوەی كە پارەیەكی زۆریش سەرف دەكەن تاوان و خراپـەیـەكی زۆریـش ئـەنجام دەدەن،وە هەنـدێك جـار یـش ئـەم جـۆرە تێكەڵاوییـە سـەری كێشـاوە بۆتەڵاقـدان و هەڵوەشـاند نـەوەی خێزانـەكان و درووسـتبوونی شەڕ و ناكۆكی.......

وەك وتمان: خۆشی و شادیەكان ڕێگەی لێ نەگیراوە فـەرمووو ئەگـەر تـۆ حەزت لە خۆشی و شادی یە لە باتی مەڕێك دوو مەڕ سەر ببڕە و خـزم و كەس و كار وئەهلی گەڕەك و برادەرەكانی خۆت بانگ بكە و لـە مالـەوە نان و خواردنێكیان بۆ دروست بكە ئەمە باشترین خۆشی و شادی یە،نـە تاوان و نەخراپەكاری و نە تێكەڵاوی ژن و پیاوی تیادا ڕوو نـادات،وە لـە هەمان كاتدا ئەبێتە هـۆی ڕژانـدنی خێـر و بەرەكـەتێكی زۆریـش بەسـەر خـۆت ومـالٚ و خێزانیشـتدا،كاتێـك ئـەم سـونەتە ئـەنجام نادەیـت كـە پارەیەكی كەمتریشی تێ دەچێت لە هەمان كاتدا دەچیت پارەیەكی زۆر سەرف دەكەیت بۆ هێنانی تیپی مۆسیقا ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە سەرقاڵی ڕەقس و سەما و گۆرانی و جۆرەها تاوان و خراپەكارین...چـۆن وەڵامـی پەروەردگارت دەدەیتەوە؟

سوننەتە ئەم سێ خاڵە لە كاتی دەعواتی وەلیمە ڕەچاو بكرێت:
یەكەم/ وەلیمەكە بكەوێتە دوای سێ ڕۆژ لە گواستنەوەی خێزانی.
دووهەم/ خەڵكی خواناس و چاكی بۆ دەعوات بكـات ئـیتر دەوڵەمەنـدبن یان هەژار جیاوازی نییە، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {لا تُصَاحِبْ إِلاَّ مُؤْمِنًا ، وَلا يَأْكُلْ طَعَامَكَ إِلاَّ تَقِيٌّ} مشكاة المصابيح (٥٠١٨).

واتــە: هاوڕێیــەتی كەسـێك مەكـە مەگـەر ئیمانـدار و خوانـاس بـێ،وە باكەسێكیش نانی تۆ نەخوات مەگەر لە خوا ترس بێ.

ئەم فەرمودەیە بكە بەیاسایەك بۆ خۆت ئەگەر وویستت دەعواتێك ساز بكەیت، ئایا بۆ ژن گواستنەوەبێت یان بۆ منـداڵ بـوون باكەسانی چاك وئیمان داربن.

سێهەم/ ئاژەڵێك یان زیاتر سەرببڕێت ئەگەر هەیبوو.

١٦/ وەلیمە درووستە بەبێ گۆشتیش بكرێت ئەگەر نەبوو.

١٧/ دروسـتە خـەڵكی دەوڵەمەنـد یارمـەتی زاوا بـدەن بـۆ سـاز كردنـی خواردنی وەلیمە.

١٨/ حەرامە دەعواتی وەلیمـە تایبـەت بكرێـت بـە دەوڵەمەندەكانـەوە و هەژارانی لێ بێ بەش بكرێت.

خۆ ئەگەر هاتوو ئەم خواردنە تایبەت كرا بە دەوڵەمەندەكان و هەژارانی لێ بێ بەش كرا ئەمە بـە خرابترینـی خـواردن دادەنرێـت وەك پێغەمبـەر ﷺ فەرمویەتی:(( شَرُّ اَلطَّعَامِ طَعَامُ اَلْوَلِيمَـةِ يُـدْعَى لَهَـا الأَغْنِيَـاءُ ويمنعها المساكين )) ئیمامی بوخاری و مسلم ڕیوایەتیان كردووە.

واتـە: خـراپترینی خـواردن خـواردنی وەلیمەیەكـە دەوڵەمەنـدەكانی بـۆ بانگ بكرێت و هەژارانی لێ بێ بەش بكرێت.

١٩/ واجبە هەر كەسێك دەعوات كرا بۆ خواردنی وەليمە وەلأم بداتـەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتی: (( وَمَنْ لَمْ يُجِبْ الدَّعْوَةَ فَقَدْ عَصَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ ))ئيمامی بوخاری و مسلم ڕيوايەتيان كردووە.

واتـە: ئـەو كەسـەی كـە بـانگ كـرا بۆدەعـوەت و پاشـان نـەهات ئـەوە سەرپێچی ئەمری خوا و پێغەمبەری كردووە ﷺ .

پێويستە كاتێك كەسێك دەعوەت كرا لووت بەرزی و تەكەبور نەی گـرێ و ئاسـايی بـێ بـە لايـەوە هـەژار بـێ يـاخود دەوڵەمەنـد وەلامـی دەعوەتەكـەی بداتـەوە و بچـێت بـۆ مـاڵی ئـەو پيـاوە كـە بـانگی كردووە،ئەگەر بە ڕۆژوو نەبوو لە خواردنەكە بخوات وە ئەگـەر بـە ڕۆژوو بوو ئەوا دۆعای خێريان بۆ بكـات،وە هـەروەها ئەگـەر ڕۆژووی سـوننەت بـوو دەتوانێـت ڕۆژووەكـەی بشـكێنێت و لـە خواردنەكـە بخـوات، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتی (( فَإِنْ شَاءَ طَعِمَ وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ))ئيمامی موسليم گێڕاويەتييەوە.

واتە:ئەگەر ويستی لە خواردنەكە بخوات وە ئەگـەر نەشـی وويسـت وازی لێ بێنێ.

٢٠/ سوننەتە ئەو کەسانەی کە ئامادە دەبن لە ماڵی زاوا لە دوای خواردن دۆعای خێر یان بۆ بکەن و بڵێن : ((**اللهم اغفر لهم وارحمهم وبارك لهم فيما رزقتهم**)) التعليقات الحسان على صحيح ابن حبان (٥٢٧٥).

واتە: خوایە لێیان خۆشبە و ڕەحمەت و میهرەبانی خۆتیان بەسەردا برژێنە و بەرەکەت و ڕۆزی خۆتیان بۆ زیاد بکە.

پاشان بەتایبەت دۆعای خێر دەکەیت بۆ بوك و زاوا کە خوای پەروەردگار نێوانیان پڕ بکات لە خێر و بەرەکەت و خۆشی وە کۆیان کاتەوە لە سەر خێر و بەندایەتی وەك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ((**بارك الله لك وبارك الله عليك وجمع بينكما في خير**))مشكاة المصابيح( ٢٤٤٥).

٢١/ درووستە بوك خزمەتی میوانەکان بکات بەو مەرجە داپۆشراو بێت و ترسی ئەوەی نەبێت توشی فیتنە ببێت.

مەرجەکانی پۆشاکی شەرعی بە کورتی:

یەك/ ئەو پۆشاکە هەمو لاشەی بگرێتەوە لەسەرەوە هەتا پێیەکانی.

دوو/ نابێت پۆشاکێکی ڕازاوە و جوان بێت.

سیّ/ پێویستە پۆشاکێکی قایم بێت و لاشەی لێوە دیار نەبێت.

چوار/ نابێت تەنك بێت و بنوسێت بە لاشەیەوە.

پێنج/ نابێت بۆنی خۆشی پێوە بێت.

**شەش/ نابێت وەكو پۆشاكی پیاوان بێت.**

**حەوت/ وەهەروەها نابێت وەكو پۆشاكی ئافرەتانی بێ باوەڕبێت.**

**هەشت/ نابێت جۆرە پۆشاكێكی سەرسوڕهێنەر و ناوازە بێت.**

**٢٢/ درووستە ئافرەتان لە كاتی گواستنەوەی بوكدا تەنها دەف بەكار بهێنن وەك ئیعلان كردن و هەندێك هۆنراوەی جوان بڵێن بەو مەرجە وەسفی جوانی ئافرەتان و مەشروباتی تیادا نەبێت.**

**٢٣/ واجبە لەسەر بوك و زاوا خۆیان بپارێزن لە هەموو تاوان و خراپەیەك بەتایبەت ئەوەی كەوەك عادەتی لێ هاتووە من لێرە ئاماژە دەكەم بە هەندێكی:**

**یەك/ دووركەوتنەوە لە وێنەگرتن و هەڵواسینی وێنەی گیان لەبەر بە هەموو شێوەیەك.**

**وەك عەلی كوڕی ئەبو تالیب فەرمویەتی:دەعوەتێكم بۆ پێغەمبەرﷺ ساز و ئامادەكرد،كاتێك پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە چەند ڕەسمێكی گیانلەبەری بەسەر پەردەكەیانەوە بینی دەست بەجێ گەڕایەوە ونەهاتە ژوورەوە(( فَقُلْتُ : يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا رَجَعَكَ بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي ؟ )) ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی تۆی گەڕاندەوە دایك و باوكم بە فیدای تۆ بن ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( قَالَ : إِنَّ فِي الْبَيْتِ سِتْرًا فِيهِ تَصَاوِيرُ ، وَإِنَّ الْمَلائِكَةَ لا تَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ تَصَاوِيرُ ))** اداب الزفاف في السنة المطهرة(٣٣).

واتــە:لــە ماڵەکــەی تــۆدا پەردەیــەکی تیادایــە کــە ڕسمــی پێوەیــە فریشتەکانیش نایەنە ماڵێکەوە کە ڕسمی تیابێ.

وە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە مەلائیکەتی لە گەڵ دایـە و لێـی جیانابنـەوە بۆیە ئەویش گەڕایەوە.

وەك زۆر ڕوونە کە پێغەمبەر ﷺ نەچووە ماڵی عەلی لەبەر ڕسمێك کـە بە پەردەی خانووەکەیانەوە چـنرابوو یەکسـەر گەڕایـەوە،ئـەی چـی بـە خۆمان بڵێین ئەمڕۆ کە ماڵەکانمان بەڕەسمی باوك و برا وخزم و کـەس و کار نەخشێنراون؟

دوو/ لابردنـی مـووی بـرۆ و ڕوخسـار و شـاش کردنـی ددان و ڕێککردنـی لــووت و خـــاڵ کـــوتین دانـــانی قـــژی دەســـتکرد بـــۆ ڕزاندنـــەوەی ئافرەتان.......ئەمانە هەمووی نەفرەتی لەسەرە.

وەك پێغەمبـەر ﷺ فەرمویـەتی: ((لَعَـنَ اللَّـهُ الْوَاشِـمَاتِ وَالْمُسْتَوْشِـمَات وَالْمُتَنَمِّصَاتِ وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللَّهِ تَعَالَى )) ئیمامی بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

واتـە:خـوای پـەروەردگار نـەفرەتی کـردووە لـەو ئافرەتانـەی کـە خـاڵ دەکـوتن وە لەوانــەی بــرۆ و مــوی ڕومــەتیان هەڵــدەگرن و ئەوانــەی دانەکانیان بۆجوانی شاش دەکەن .

پێویستە دایکان وخوشکان خۆیان لەم تاوانانە بپارێزن چـونکە زۆر جـار لە کاتی گواستنەوەدا هەندێك لەم کارانەی بۆ ئەنجام دەدرێ.

ئەو ئافرەتەی کە دەستکاری لووتی دەکات بە مەبەستی جوانکاری وە لــە ڕوی تەندروســتییەوە هــیچ موشــکیلەیەکی نییــە یــان دەســتکاری دانەکانی دەکات بە مەبەستی جوانکاری و لە ڕوی تەندروستییەوە هـیچ نەخۆشیەکی نییە دەکوێتە بەر ئەم فەرمودەیە.

سێ/ بۆیە کردنی نینۆك و درێژ کردنـی ئەمـەش عـادەتی ئافرەتـانی بـێ باوەڕە،بەڵکو عـادەتی ئافرەتـانی موسـڵمان بـەکار هێنـانی خەنەیـە بـۆ دەست و پەنجە.

چوار/ ڕیش تاشینی زاوا لـە شـەوی گواسـتنەوەی بـوك ئەمـەش دیسـان پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم و خۆشوبهاندنە بە بێ باوەڕانەوە.

٢٤/ لە پەنجەکردنی حەلقەی ژن هێنان بـە حـەرام دادەنرێـت بـۆ بـوك و زاوا چونکە ئەمەش لاسایکردنەوەی گاوورەکانە.

٢٥/بەکار هێنانی ئاڵتون بە هـەموو شـێوەکانییەوە بـۆ پیـاوان حەرامـە، بەڵام دروستە ئەنگوستیلەی زیو بەکار بێنن.

٢٦/ واجبە پیاو بە جوانترین شێوە هەڵسوکەوت لە گەڵ خێزانیدا بکـات و نــەرمی لــە گەڵــدا بنوێنێــت بەتایبــەت ئەگــەر تەمــەنی کــەم بــێ وەك

**پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((خیركم خیركم لأهله وأنا خیركم لأهلي))** مشكاة المصابيح ( ٣٢٥٢).

**٢٧/ ئەگەر دەعوات كرا بۆ خواردنی وەلیمەیەك و بەلاَم لەو شوێنەدا تاوان و خراپەكاری تیادا ئەنجام دەدرا وەك دەهۆڵ و زوڕنا و تێكەڵی ژن و پیاو، واجبە لەسەری بگەڕێتەوە دواوە یان ئەو خراپە و تاوانانەی كە دەكرێت ڕێگری لیّ بكات و نەیهێڵێت،بەتایبەت ئەمڕۆ كە هەمووی تەصویر دەكرێت و پاشان بڵاو دەكرێتەوە ئاشكرایە كە چەندین خراپە و تاوانی تری لیّ دەكەوێتەوە و دەبێتە مایەی ئاژاوە لە نێوان موسڵمانان دا.**

**پێغەمبەر ﷺ ئومەتەكەی ئاگادار كردووەتەوە كە ئەم جۆرە تاوانانە پەیدا دەبن وەك فەرمویەتی:** (( لَيَكُونَنَّ مِنْ أُمَّتِي أَقْوَامٌ يَسْتَحِلُّونَ الْحِرَ وَالْحَرِيرَ وَالْخَمْرَ وَالْمَعَازِفَ)) سلسلة الأحاديث الصحيحة (٩١).

**واتە: خەڵكانێك پەیدا دەبن لە ئوممەتی من ئەم چوار گوناهە حەڵاڵ دەكەن بۆ خۆیان:**

**یەكەم:بریتی یە لە زینا و داوێن پیسی كە بە ناوی ئازادی یەوە حەڵاڵی دەكەن.**

**دووهەم: بریتی یە لەمەی خواردنەوە كە بە ناوی مەشروباتی ڕۆحیەوە حەلاڵی دەكەن .**

**سێهەم: پۆشاکی ئاوریشم ئەپۆشن حەلاڵی دەکەن .**

**چوارەم:ئامرازەکانی مۆسیقا حەلاڵی دەکەن .**

**ئـەمڕۆ بەچـاوی خۆمـان دەیبیـنین کـە چـۆن بـەناوی دینـەوە هـەموو ئامرازەکانی مۆسیقا حەلاڵ کراوە بۆ خەڵك!**

**٢٨/ چەند ئامۆژگارییەك بۆ بوك و زاوا:**

**یـەك / هـەر دووکیـان مـل کـەچ و گوێڕایـەڵی شـەریعەتی ئیسـلام بـن و پێچەوانەی فەرمانی خوای گەورە و پێغەمبەر ەکەی ﷺ نەجولێنەوە و نەکەونە شوێن لاسایکردنەوەی بیٚ باوەڕان.**

**دوو/ هەر دووکیان مل کەچ بن بۆ ئەنجامدانی ئەو مـاف و ئەرکانـەی کـە هەیانە بەسەر یەکەوە لە چوار چێوە شەرعدا باهیچیان مـافی ئـەویتریان پێشێل نەکات چونکە هەر دووکیـان مافیـان بەسـەر یەکـەوە هەیـە وەك خوای گەورە فەرموویـەتی: {وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ(٢٢٨)}سورەتی بەقەرە.**

**سـیٚ/ لەسـەر ئافرەتـان واجبـە گوێڕایـەڵی مێردەکانیـان بکـەن بـە پێـی توانایــان وە ڕێگــەیان پــیٚ نــادریٚ بــەناوی بەندایەتییــە وە مــافی مێردەکانایـان پێشـێل بکـەن چـونکە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: ((لا تصم المرأة وزوجها شاهد إلا بإذنه (غير رمضان) ))** صحيح الجامع (٧٣٥٢).

واتـە:بـا هـیچ ژنێـك ڕۆژوو نـەگرێت ومیردەكـەی لـەماڵ بیـت جگـە لـە ڕەمەزان.

بەتایبەت ئەگەر مێردەكەی پێویستی پێی بوو بۆ كـاری شـەرعی واجبـە وەلآمی بداتـەوە و دەست لـە كارەكـانی هـەڵبگرێت ئەگـەر دەسـتی لـە هەویریشدا بێت.

چوار/ واجبە لەسەر ئافرەتان خزمەتی مێردەكانیـان بكـەن و خـواردن و خواردنەوەیان بـۆ ئامادەبكـەن وپۆشـاك وجـل و بـەرگیان بـۆ بشـۆرن و منداڵەكانیان بە ڕێك و پێكی بۆ پەروەردە بكەن.

پێنج/ هەندێك كەس لەشەوی گواستنەوەدا وادەزانێـت ئـیتر مـەعفوە لـە نوێژ و بەندایەتی و كەمتەرخەمی دەكات لە نوێژەكانی بەتایبەت نوێـژی بەیانی پێویستە ئاگامان لـەوەبێ كاتێـك تـۆ خێزانـت هێنـا سـوننەتێكی گـەورەی ئیسـلامت جێبـەجێ كـردووە چـۆن دەبێـت هـەر لـە شـەوی یەكەمەوە خۆت تووشی گوناهی گەورە بكەیت كە بریتییە لە فەوتانـدنی نوێژەكانت.

# بەشی شەشەم
# مافەکانی ژن و پیاو بەرامبەر یەکتر

شـەریعەتی ئیسـلام وای دانـاوە کـە خێـزان پڕۆژەیەکـە درووسـت بـووە لەسەر بناغەی هاوبەشێتی لە نێوان دوو کەسدا کە بریتیین لە پیاو و ژن وە بەرپرسـی یەکـەمیش لـەم پڕۆژەیـە پیـاوە وەك خـوای گـەورە فەرمویـەتی: { الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ بِمَا فَضَّلَ اللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنْفَقُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللَّهُ....(٣٤) }سورەتی نیساء.

واتە:پیاوان سەرپەرشتیارن بەسەر هاوسـەرەکانیانەوە، ئەمـەش بـەهۆی ڕێزو زیادە ئەرکێکەوە کە خوا داویەتی بەهەنـدێک بەسـەر هەنـدێکی تردا سەرەڕای ئەوەی کە پیاوان لەماڵ و سامانیان خەرج دەکەن لـە پێناوی ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانی ئافرەتاندا، لـە ولاشـەوە ئافرەتـانی ژیرو دیندار و گونجاو هەمیشە گوێڕایەڵی مێردەکانیانن، نهێنـی نێـوان خۆیان و مێردەکانیان دەپارێزن بەتایبەت ئەو نهێنیانەی خوای گـەورە دەیەوێت پـارێزراو بـن بـەهۆی ئـەوەی کـە خـوا مافـەکانی ئـەوانی پاڕاستووە.

وە ئاینی پـیرۆزی ئیسـلام بـۆ هەریەکـە لـە ژن و پیـاو کۆمـەڵێك مـاف و ئەرکی داناوە کە هۆکارە بۆ بـەردەوام بـونی ئـەم پـڕۆژە گەورەیـە وەك

**خـــــوای گـــــەورە فەرموویـــــەتی: { وَلَهُــنَّ مِثْــلُ الَّــذِي عَلَــيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ......(٢٢٨ ) }سورەتی بەقەرە.**

**واتە: ژنان كۆمەڵێك ماف و ئەركیان هەیە لەسەر پیاوان هەر وەك پیاوان كۆمەڵێك ماف و ئەركیان هەیە لەسەر ژنان.**

**لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم یان پرسی ئایا مافی خێزانی یەكێك لـە ئێمە چییە لەسەرمان ؟**

**فــەرمووی : ((أَنْ تُطْعِمَهَا إِذَا طَعِمْتَ وَتَكْسُوهَا إِذَا اكْتَسَيْتَ، وَلَا تَضْرِبْ الْوَجْهَ، وَلَا تُقَبِّحْ وَلَا تَهْجُرْ إِلَّا فِي الْبَيْتِ))**صَحِيح الْجَامِع:( ١٧).

**واتە:خواردن وپۆشاكی بۆ پەیدا بكات كاتێك پێویستی پێی هەبوو،وە لە دەم و چاوی نەدات و قسەی خراپی پێ نەڵێ و لێی دوور نەكەوێتــەوە و جێگەی لێ جیانەكاتەوە مەگەر لە ناو خانوەكەی خۆیدا نەبێت.مەبەست ئەوەیە لە كاتی دڵشكانیدا پیاو نابێت ماڵ بە جێ بێڵێـت تـەنها جێگـەی لێ جیادەكاتەوە بۆ ئەوەی خێزانی بە خۆیدا بچێتەوە.**

**لەبەر پاراستنی شیرازەی خێزانە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم گاڵتــە و یاری كردنـی پیـاوی لـە گـەڵ خێزانەكەیـدا بـە چـاكە نـاو بـردووە، وەك فەرموویــەتی: ((كُلُّ شَيْءٍ لَيْسَ مِنْ ذِكْرِ اللهِ ، فَهُوَ لَهْوٌ وَسَهْوٌ، إِلَّا أَرْبَعَ خِصَالٍ: مَشْيُ الرَّجُلِ بَيْنَ الْغَرَضَيْنِ وَتَأْدِيبُهُ فَرَسَهُ، وَمُلَاعَبَتُهُ أَهْلَهُ، وَتَعَلُّمَ السِّبَاحَةِ))** صَحِيح التَّرْغِيبِ وَالتَّرْهِيب:( ١٢٨٢).

**واتە: هەر شتێك کە یادی خوای گەورە نەبێت بە هەڵە و بێ ئاگایی دادەنرێت جگە لە ئەم چوار سیفەتە:پێش برکێ کردن و ڕاهێنانی ئەسپ و ماین و یاری کردنی پیاو لەگەڵ خێزانەکەیدا و فێربوونی مەلەوانی.**



# سەرەتا دێینە سەر مافەکانی ژن لەسەر پیاو

١/مافی ژنە لەسەر پیاوەکەی کە بەرێکو پێکی ژیان لەگەڵ خێزانەکەیدا بباتە سەر و ستەمی لێ نەکات و ئارامی لێ بگرێت وەك خوای گەورە فەرموویەتی: {وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِنْ كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا (١٩)} سورەتی نیساء.

واتە: بە چاکی لەگەڵ خێزانەکانتان دا ژیان ببنە سەر و رێزیان لێ بگرن خۆ ئەگەر رقتان لێیان هەستا لەبەر هۆیەك لە هۆیەکان ئارام بگرن لەوانەیە ئێوە رقتان لە شتێك بێتەوە بەلاّم خوای گەورە خێر و چاکەیەکی زۆرتان بە نسیب بکات.

چونکە بەڕاستی رێزگرتن لە ئافرەتان بەڵگەیە لەسەر تەواوی کەسایەتی پیاوان و لە هەمان کاتدا بێرێزی پێکردنیان بەڵگەیە لەسەر بێنرخی و سوکی پیاوان.

٢/ مافی ژنە لەسەر پیاوەکەی کە ئارام بگرێت لەسەر ناڕەحەتییەکانی و چاو پیۆشی لێ بکەن وەك پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (( لَا يَفْرَكْ مُؤْمِنٌ مُؤْمِنَةً، إِنْ كَرِهَ مِنْهَا خُلُقًا ، رَضِيَ مِنْهَا آخَرَ))ئیمامی موسلیم گێڕاویەتییەوە.

واتە: باهیچ پیاوێك رقی لە خێزانەکەی نەبێتەوە خۆ ئەگەر لە سیفەتێکی نارای بێ لە چەندین سیفەتی تری رازییە.

٣/ مافی ژنە لەسەر پیاوەكەی كە پارێزگاری لە شەرەف و كەرامەتی خێزانەكەی بكات و ڕیگە نەدات تێكەڵاوی پیاوانی نامەحرەم ببێت یان بەبێ لەچك و پۆشاكی شەرعی لە ماڵ بچێتەدەرەوە چونكە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ((وَالرَّجُلُ رَاعٍ فِي أَهْلِهِ ، وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ...)ئیمامی بوخاری گێڕاویەتییەوە.

واتە: پیاوان بەرپرسن لە ماڵ و خێزانیان...)

٤/ مافی ژنە لەسەر پیاوەكەی ئەوەندەی دەكرێت خێزانەكەی فێری چۆنێتی بەندایەتی و خواناسین بكات چونكە ئەمە لە پەیدا كردنی نان و ئاو بۆ ئەوان گرنك ترە وەك خوای گەورە فەرموویەتی:{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ .....(٦)}سورەتی تەحریم.

واتە: ئەی ئەوانەی كە بڕواتان هێناوە خۆتان و ماڵ و منداڵتان بپارێزن لەو ئاگرەی كە سوتەمەنییەكەی ئینسان و بەردە.

٥/مافی ژنە لەسەر پیاوەكەی كە ڕیگەی بدات سەردانی ماڵی خزم و كەس و كاری بكات بەو مەرجە بە پۆشاكی شەرعییەوە لە ماڵ بچێتەدەرەوە و بۆنی عەتر بە كار نەهێنێت چونكە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ((أَيَّتُكُنَّ خَرَجَتْ إِلَى الْمَسْجِدِ فَلَا تَقْرَبَنَّ طِيبًا)) ئیمامی موسلیم گێڕاویەتییەوە.

**واتە: هەر ئافرەتێك لە ماڵ چووەدەرەوە بۆ مزگەوت با بۆنی خۆش نزیکی خۆی نەکاتەوە.**

**٦/ مافی ژنە لەسەر پیاوەکەی کە نهێنی خێزانەکەی بپارێزێت بەتایبەت بابەتی سەرجێی کردن پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم ئەو پیاو ژنانەی کە نهێنی سەرجێی خۆیان لای خەڵك باس دەکەن شوبهاندوونی بە شەیتانێکەوە لەسەر جادەیەك بگاتە شەیتانێکی تر و جیماعی لەگەڵدا بکات و خەڵك سەیریان بکەن وەك فەرموویەتی: ((.....فَلَا تَفْعَلُوا، فَإِنَّ مَثَلَ ذَلِكَ مَثَلُ شَيْطَانٍ لَقِيَ شَيْطَانَةً عَلَى قَارِعَةِ الطَّرِيقِ فَغَشِيَهَا وَالنَّاسُ يَنْظُرُونَ))**صَحِيح التَّرْغِيبِ وَالتَّرْهِيب: (٢٠٢٢).

**٧/ مافی ژنە لەسەر پیاوەکەی کە پرس و ڕاوێژی پێ بکات بەتایبەت لەو کار و بارانەی کە پەیوەندی دارە بە ماڵ و منداڵەوە،چونکە پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم پرس و ڕاوێژی بە خێزانەکانی دەکرد و بۆچونەکانیانی پەسەند دەکرد وەك لە صوڵحی حودەیبەدا پرس و ڕای کرد بە دایکی ئیمانداران ئومو سەلەمە- خوای لێ ڕازی بێ .**

**٧/ مافی ژنە لەسەر پیاوەکەی کە دوای نوێژی عیشا زوو بگەڕێتەوە بۆلای چونکە نەگەڕانەوە هەتا درنگانی شەو دەبێتە هۆی بێ زاری و سەغڵەت بوونی خێزانی....وە پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم ئینکاری لە عبداللە ی کوڕی عەمر کرد کە هەتا درنگانی شەو خەریکی شەو نوێژ و**

بەندایەتی بوو پێی فـەرموو:((**وَإِنَّ لِزَوْجِكَ عَلَيْكَ حَقًّا**)) ئیمـامی بوخـاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

واتە: بەڕاستی خێزانەكت مافی لەسەرت هەیە.

كەواتە:ئەگەر ڕێگە نەدرێ بەشەو نوێژ و بەندایەتی لە كاتێكدا كە ببێتـە هۆی خواردنی مافی خێزانی ئایا چۆن ڕێگە دەدرێت پیاو هـەتا درنگـانی شەو نەگەڕێتەوە ماڵەوە و سەرقاڵی نێرگەلە كێشـان و دۆمینـەكردن بـێ ،یان هەتا درنگانی شەو سـەرقاڵی تـۆڕە كۆمەڵایەتییـەكان و ئەنتـەرنێت بێت ! ؟

٨/ مافی ژنە لەسەر پیاوەكەی كە دادپەروەر بێت لە نێوان خێزانەكانیدا ئەگەر زیاتر لە خێزانێكی هەبوو لە پۆشاك و خواردن و خواردنەوە جێگە و شەو مانەوە خۆ ئەگەر ستەمی كرد و نەیتوانی دادپــەروەری بپارێزێـت لە ڕۆژی دوایدا كە دێت بۆ سەرای مەحشەر لایەكی پوچە و بەخواری بـە ڕێگاوە دەچێت وەك پێغەمبەر صلى الله عليه وسـلم فەرموویـەتی: ((**مَنْ كَانَ لَهُ امْرَأَتَانِ فَلَمْ يَعْدِلْ بَيْنَهُمَا جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَحَدُ شِقَّيْهِ مَائِلٌ**)) الجامع الصحيح للسنن والمسانيد(١٨/ ٤٤٠).

# مافەکانی پیاو لەسەر ژن

لە دوای باسکردنی مافەکانی ژن لەسەر پیاو دێنە سەر باسی مافـەکانی پیاو لەسەر ژن

بێگومان مافی پیاوان لەسەر خێزانیان زۆر پاداشتی گەورەیە خۆ ئەگـەر ئافرەتان بەرێکوپێکی ئەنجامی بدەن دەچنە بەهەشتەوە وەك پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ((إِذَا صَلَّتْ الْمَرْأَةُ خَمْسَهَا ، وَصَامَتْ شَهْرَهَا ، وَحَفِظَتْ فَرْجَهَا وَأَطَاعَتْ زَوْجَهَا ، قِيلَ لَهَا: ادْخُلِي الْجَنَّةَ مِنْ أَيِّ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ شِئْتِ )) صَحِيح التَّرْغِيبِ وَالتَّرْهِيب: (١٩٣١).

واتە: ئەگەر ئافرەت پێـنج فـەرزەی نوێژەکـەی ئـەنجام بـدات و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرێت و پارێزگاری لە داوێنی خـۆی بکـات و گوێڕایـەڵی مێردەکەی بکات، پێی دەوترێت: لە هەر درگایەك لە درگاکانی بەهەشـت دەتەوێت بچیتە ژوورەوە بچۆرە ژوورەوە.

خوشکی بڕوادار و سەنگین بزانـە چـۆن پێغەمبـەر صـلی الله علیـه وسـلم گوێڕایەڵی کردنی مێرد و پاراسـتنی داوێنـی کـردووە بـە هۆکـاری چـونە بەهەشتت، ووریابە بە هۆی تاوان و سەر پێچـی فـەرمانی مێردەکەتـەوە درگاکانی بەهەشت لەخۆت دانەخەیت.

١/ مافی پیاوە لەسەر خێزانەکی کە پارێزگاری لە شەڕەف و کەرامـەتی مێردەکەی بکات و بـە جـوانی مـاڵ و منداڵـەکانی پـەروەردە بکـات وەك

**پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: ((وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا وَوَلَدِهِ ، وَهِيَ مَسْئُولَةٌ عَنْ رَعِيَّتِهَا)ئیمامی بوخاری و موسلیم گێڕاویەتییەوە.**

**واتە: ئافرەتان بەرپرسن لە ماڵی منداڵی مێردەكانیان .....**

**٢/ مافی پیاوە لەسەر خێزانەكەی كە خۆی بۆ بڕازێنێتەوە و هەمیشە بەڕوویەكی گەشەوە پێشوازی لە مێردەكەی بكات وەك پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم لە وەسفی باشترین ئافرەتدا فەرموویەتی**

**:(( الَّتِي تَسُرُّهُ إذا نَظَر وَتُطِيعُهُ إذا أمَرَ ولا تُخالِفُهُ في نَفْسِها ولا مالِها بِما يَكْرَهُ))** صحيح الجامع: (٣٢٩٨).

**واتە: ئەو ئافرەتەی كاتێك مێردەكەی سەیری دەكات دڵی پێخۆش دەكات لە بەر زۆری سیفەتە جوانەكانی وەك خواناسی وشەرمكردن و زمان شیرینی و ڕەوشت بەرزی و ڕووگەشی و ڕووخۆشی لە گەڵیدا وە مێردەكەی هەر فەرمانێكی بەسەردا بدات بەبێ چەند وچوون جێبەجێی بكات لە سنووری شەرعدا و موناقەشەی لە گەڵدا نەكات و پێچەوانەی فەرمانی مێردەكەی نەجوولێتەوە چ لە شتێكدا كە پەیوەندی بەنەفسی خۆیەوە هەبێت یان بە سەروەت و سامانیەوە كە مێردەكەی پێی ناخۆش بێت.**

بەڕاستی ئەوەی جێگەی سەر سوڕمانە لـەم سـەردەمەدا ئافرەتـان زۆر کەمتەر خەمن لەماڵەوە و هیچ گرنگـی بـە خۆیـان نـادەن بـەڵام کاتێـك دەچـنەدەرەوە بـە تـەواوی توانـا خۆیـان دەڕازێننـەوە بـەبێ گوێدانـە پۆشـاکی شـەرعی ...بێگومـان ئەمـە بـەتاوانێکی گـەورە دادەنرێـت و پێویستی بە تەوبە کردنە.

٣/ مافی پیاوە لەسەر خێزانەکەی کە بە بێ پرسی ئەو لـە مـاڵ نەچـێتە دەرەوە تەنانەت ئەگەر بۆ مزگەوتیش بێت پێویستە پرس بە پیاوەکەی بکات چونکە لەبنەڕەتدا کار و باری ژنان لە ماڵەوەیە نـەك دەرەوە وەك خوای گەورە فەرموویەتی: { وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ ....(٣٣)} ئەحزاب.

واتـە: پابەنـدبن بەماڵـەکانی خۆتانـەوە و مەچـنەدەرەوە مەگـەر بـۆ پێویستییەك نەبێت.

٤/ مافی پیاوە لەسـەر خێزانەکـەی کـە ڕێگـە نـەدات ئـەو کەسانە بێنـە ناوماڵەکەی کە پیاوەکەی پێی خۆش نـەبێ و ڕقـی لێیـان بێتـەوە، وەك پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ((فَأَمَّا حَقُّكُمْ عَلَى نِسَائِكُمْ: فَلَا يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ أَحَدًا تَكْرَهُونَهُ وَلَا يَأْذَنَّ فِي بُيُوتِكُمْ لِمَنْ تَكْرَهُونَ))الجامع الصحيح للسنن والمسانيد(١١/ ٤٠).

٥/ مافی پیاوە لەسەر خێزانەکەی کە ڕۆژی سـوننەت نـەگرێ بـە ئیزنـی پیاوەکـەی کاتێـك لـە ماڵـەوەبێ،وەك پێغەمبـەر صـلی الله علیـە وسـلم

فەرموویەتی: ((لَا يَحِلُّ لِلْمَرْأَةِ أَنْ تَصُومَ يَوْمًا وَاحِدًا مِنْ غَيْرِ شَهْرِ رَمَضَانَ وَزَوْجُهَا حَاضِرٌ إِلَّا بِإِذْنِهِ)) الجامع الصحيح للسنن والمسانيد(١١/ ٢٦).

واتە: درووست نییە ئافرەتان یەك ڕۆژ بە ڕۆژوو بن جگە لە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان کاتێك مێردەکانیان لە ماڵ بێت مەگەر مێردەکانیان ئیزنیان بدەن.

٦/ مافی پیاوە لەسەر خێزانەکەی کە ڕازی بێ بەو بەشەی خوای گەورە پێداون و بیانوی شتێك لە مێردەکەی نەگرێت کەلە توانایدا نەبێت.

٧/ مافی پیاوە لەسەر خێزانەکەی کە بە جوانی منداڵەکانی پەروەردە بکات و ئارامیان لەسەر بگرێت و جوێن و قسەی نابەجێیان پێ نەڵێ و دۆعای شەڕیان لێ نەکات چونکە ئەمە دەبێتە مایەی دڵتەنگی و بێزاری پیاوەکەی.

٨/ مافی پیاوە لەسەر خێزانەکەی کە هەڵسوکەوتی جوان بێت لەگەڵ باوك و دایك و کەس و کاری مێردەکەیدا و لوتەلا نەبێت بەرامبەریان.

٩/ مافی پیاوە لەسەر خێزانەکەی کە هەرکاتێك پێویستی پێی هەبوو وەڵامی بداتەوە بە جوانی ئەگەر دەستی لە هەویریشدا بێت وەك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی:((إِذَا دَعَا الرَّجُلُ زَوْجَتَهُ لِحَاجَتِهِ ، فَلْتَأْتِهِ وَإِنْ كَانَتْ عَلَى التَّنُّورِ))صَحِيح الْجَامِع:( ٥٣٣).

واتـە:هـەر کاتێـك پیـاوی بـانگی خێزانــی خـۆی کـرد بـۆ کـاری شـەرعی باوەلاٌمی بداتەوە ئەگەر دەستی لە تەنووریشدا بێت.

١٠/ مافی پیاوە لەسەر خێزانەکەی کە بە جوانی لەگەڵیدا بـژێت و داوای تەلاٌقی لیٚ نەکات مەگەر پاساوێکی شەرعی هەبێت وەك پێغەمبەر صـلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ((أَيُّمَا امْرَأَةٍ سَأَلَتْ زَوْجَهَا الطَّلَاقَ فِي غَيْرِ مَا بَأسٍ فَحَرَامٌ عَلَيْهَا رَائِحَةُ الْجَنَّةِ)) الجامع الصحيح للسنن والمسانيد(١٨/ ١٩).

واتە: هەر ئافرەتێك داوای تەلاٌق لە مێردەکەی بکـات بـە بـیٚ هۆکـارێکی شەرعی بۆنی بەهەشتی لەسەر حەرامە.

١١/ مافی پیاوە لەسەر خێزانەکەی کە منەتی بەسەردا نەکات ئەگەر بـە پارەی خۆی هەندێك خزمەتی ماڵەوەی کرد چونکە منەت کردن پاداشـت بەتاڵ دەکاتەوە لە هەمانکاتدا پێویسـتە لەسـەر پیـاوانیش ئەمـە لەبـەر چاو بگرن.

# بەشی حەوتەم

# ئەو نیكاحانەی لەئیسلامدا قەدەغەكراون

بەداخەوە هێشتا هەندێك لەو نیكانەی كە ئیسلام حەرامی كردووە لە ناو موسڵمانناندا بوونیان هەیە و جیٚ بەجیٚ دەكرێن،بە یارمەتی پــەروەردگار هــەوڵ دەدەیــن هەنــدێكیان بــە خــاڵ بــاس بكــەین بــۆ ئــەوەی چــیتر موسڵمانان نەكەونە هەڵەوە:

## یەكەم / نیكاحی ژن بە ژن .

ژن بە ژن بریتی یە لەوەی كە پیاوێك كچـەكەی خـۆی یـان خوشـكەكەی مارەبكــات لــە پیاوێــك لــە بەرامبــەردا ئــەویش كچــەكەی خــۆی یــان خوشكەكەی مارەبكات لەو.

ژن بە ژن ماناكەی لە كوردەواری خۆماندا زۆر پڕ بـە پێسـتی خۆیـەتی ژن لـە بـاتی ژنـە بـەڵام كاتێـك موسـڵمانان ژن ئـەهێنن ژن لـە بـاتی ژن نـاهێنن بـەڵكو مارەییـەكی بـۆ دادەنـێن،ئـەوە جیاوازییـە لـە نێـوان ژن هێنانی شەرعی و ژن بە ژندا كە بەناشەرعی دادەنرێت.

عوبەید الله لە نافعەوە ئەویش لە ئیبنو عومەرەوە فەرموویـەتی: (( نَهَـى رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- عَنِ الشِّغَارِ)) واتە:پێغەمبـەر ﷺ نـەهی كردووە لە ژن بە ژن.

لە پاشان فەرمووی:(( والشغار أَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ زَوِّجْنِى ابْنَتَكَ وَأُزَوِّجُكَ ابْنَتِى ، وَزَوِّجْنِى أُخْتَكَ وَأُزَوِّجُكَ أُخْتِى ،وَلاَ صَدَاقَ بَيْنَهُمَا)) ئیمامی بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

پیاوێك بە پیاوێك بڵێ: کچەکەی خۆتم لێ نیکاح بکە منیش کچەکەی خۆمت لێ نیکاح دەکەم یان خوشکەکەی خۆتم لێ نیکاح بکە منیش خوشکەکەی خۆمت لێ نیکاح دەکەم وە مارەی لە نێوانیاندا نەبێت.

واتە: ژن لە باتی ژن دادەنرێت نەك بەمارەیی.

ئیبنو عمر دیسان لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموودەیەکی ترمان بۆ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (( لاَ شِغَارَ فِي الإِسْلاَمِ ))ئیمامی موسلیم گێڕاویەتییە.

واتە: ژن بە ژن لە ئیسلامدا نیە.

کەواتە:حوکمی ژن بە ژن لە ئیسلامدا بەتاڵە و بە هیچ شێوازێك ڕێگەی پێ نادرێت.

بەڵام ئەگەر سەیری واقعی موسڵمانان بکەین دەبینین ئەم کارە لە ناو موسڵمانانندا زۆرە و هۆکارەکەیشی ـ بەداخەوە- دەگەڕێتەوە بۆ کەمتەر خەمی هەندێك لە مامۆستایان خۆ ئەگەر ئەوان ئەم نیکاحەیان بۆ خەڵك نەکردایە ئەوانیش نەیان دەتوانی کاری وائەنجام بدەن.

هەندێك بە پێی لێكدانەوەكەی نافع دەڵێن ئەگەر مارەیی لـە نێوانیانـدا نەبێ ئـەوە بـریتی یـە لـە ژن بـە ژن بـەڵام ئەگـەر مـارەیی هـەبوو ئـەوە نایگرێتەوە و درووستە.

وەڵامی ئەم بۆچوونە لە چەند ڕوویەكەوە:

١/ ئەمە تەنها لێكدانەوەی نافعە ـ ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ ـ بـەڵام بـە پێی دەقی فەرموودەكە بە گشتی حەرام كراوە وەك پێغەمبەر صـلی الله علیه وسـلم فەرموویـەتی :(( لاَ شِـغَارَ فِي الإِسْـلاَمِ )) واتـە: ژن بـە ژن لـە ئیسلامدا نیە.

٢/ ئەو ژن بە ژنانەی كە كراوە و مارەییش لە نێوانیانـدا هـەبووە،كاتێـك كێشـــەیەك كەوتووەتـــە نـــاو خێزانێكیـــان ئەویتریشـــیان بـــە زۆر هەڵوەشاندووەتەوە و بوونەتە مایەی تێكـدانی هـەر دوو خێزانەكـە و لـە ئەنجامـدا دوو پیـاو بـێ ژن دەبـن و دوو ئـافرەتیش بـێ مێـرد دەبـن و كۆمـەڵێك منـداڵیش سـەرگەردان دەبـن و دەبنـە بـارێكی قـورس بەسـەر كەس و كارەوە.

٣/ ئەگەر مارەییش لە نێواندا هەبێ كەسی یەكەم كچەكەی خۆی نـادات بـــە كەســـی دووهـــەم هـــەتا ئـــەویش كچـــەكەی خـــۆی نـــەدات بەو،كەواتە:سەرەنجام ژنی یەكەم بوو بە مارەیی ژنی دووەم .

**دووەم/ نیكاحی تحلیل كە  لە كوردەواریدا پێی دەڵێن**: (**مارە بە جاش**).

مارە بە جاش یان نیكاحی تحلیل بریتی یە لەوە پیاوێك لە دوای كەوتنی هەرسێ تەڵاقەكەی  دەچن خێزانەكەی لە كابرایەكی تر مارە دەبڕن بۆ شەوێك یان بۆ چەند سەعاتێك بەو مەرجە بچێتە لای و پاشان تەڵاقی بداتەوە بۆ ئەوەی بۆ پیاوی یەكەم حەلاڵ بێت ـ بەخەیاڵی خۆیان .

بێ گومان ئەمە كارێكی حەرامە بە پێی قورئان و سوننەت و كۆدەنگی زانایان وەك خوای گەورە فەرموویەتی: { الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلَّا أَنْ يَخَافَا أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ (٢٢٩) فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَنْ يَتَرَاجَعَا إِنْ ظَنَّا أَنْ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ (٢٣٠) }سورەتی بەقەرە.

واتە: تەڵاقێک کە پیاو بتوانێت هاوسەرەکەی تێدا بگێڕێتەوە دووجارە، ئەگەر دەیەوێت ژیانی هاوسەریی بباتە سەر نابێت تەڵاقی سێهەم بەکار بێنێت ئەگەر نەیویست دەبێت بەچاکی و بەڕێک و پێکی دەست بەرداری ببێت و بۆتان حەڵاڵ نیە هیچ شتێکیان لێ بسێننەوە لە

مارەیی و ئەو شتانەی پێتان بەخشیوون، مەگـەر بترسـن لـەوەی کـە نەتوانن چاودێری سنوورەکانی خوای گەورە بکەن خـۆ ئەگـەر ترسـان لەوەی کە ژن ومێردەکە سـنووری خـوای گـەورە ڕانـاگرن و خۆیـان گوناهبار دەکەن ئەوە ئێوە هـیچ گوناهبـار نـابن کاتێـک کـە دڵنیـان ئافرەتەکە دەیەوێت بە هەندێک سـامان، یـان دەسـت هـەڵگرتن لـە هەندێک مارەیی خۆی ڕزگار بکات، دڵنیابن ئەو شتانەی کە باسـکران سنوورەکانی خوای پەروەردگارن، لێی مەترازێن و سنوورشکێنی مەکەن، ئەوەی دەستدرێژی بکاتـە سـەر سـنوورەکانی خـوای گـەورە، ئەوانـە کەسانێکی ستەم کارن ( **٢٣٠** )خـۆ ئەگـەر بـۆ جـاری سـێهەم، پیـاو ژنەکەی خۆی تەڵاقدا، ئەوە ئیتر جارێکی تر بۆی حەڵاڵ نابێت مەگەر دوای ئەوەی شوویەکی تر بکات و هاوسەری دووهەمی بەشـێوەیەکی ئاسایی تەڵاقی بدات، یان بمرێت، ئەوە بۆیان هەیە بگەڕێنەوە بۆ لای یەکترو ژیانی ژن و مێردایەتی دەست پێبکەنەوە، ئەگەر گومان و ڕایان وابوو دەتوانن سنوورەکانی خوا گـەورە ڕابگـرن و ژیـانێکی ئاسـودەیی ببەنە سەر، جا ئەوەی کە باسکرا سنوورەکانی خوای گەورەن، ڕوونیان دەکاتەوە بۆ گەلێک کە بزانن و تێبگەن.

دەبینین خوای پەروەردگار لەم ئایەتەدا ئاماژەی کـردووە بـەو پیـاوەی کە ژنەکەی جار لە دوای جار هەرسێ تەلاقی ژنەکەی داوە بەسێ قۆنـاغ نەك بەیەك جار هەرسێ تەلاقەکەی بـەکاربێنێت، لـە پاشـان ئـەم پیـاوە

ئیتر بۆی حەلاڵ نابێتەوە ژنەکەی بێنێتـەوە لای خـۆی مەگـەر ئـەو ژنـە شـوو بکاتـەوە بـە پیاوێـك و پاشـان پیاوەکـەی بمـرێ یـان نـەگونجێن بەیەکەوە و دوای ماوەیەك تەڵاقی بدات ئەو کاتە درووستە پیاوی یەکەم بیهێنێتەوە،ئەوەی لە قورئانـدا هـاتووە ئەمەیـە،بـەڵام خـەڵك هەسـتاون فیلێکیان درووست کردووە وە نەخشەیەکیان داناوە بۆ ئـەوەی کـە ئـەم پیـاوەی ژنەکـەی لـە دەسـت بووەتـەوە و تـەڵاقی داوە ژنەکـەی بـۆ بگێڕنەوە دەچن پیاوێکی هەژار یان نابینایەك دەدۆزنەوە کە زۆر بیـانوو گر نەبێ ژنەکەی بۆ نیکاح دەکەن و دەڵێن: ئەم ژنەت بۆ نیکاح دەکەین و هەنـدێکیش پـارەی دەدەنـێ بـەو مەرجـە شـەوێك لای بـێ و بـەیانی تەڵاقی بداتەوە لە پاشان لە پیاوی یەکەمی مارە دەکەنەوە.

بەڕاستی ئەمە گوناهو تاوانە و بە نیکاحێکی بەتاڵ دادەنرێت و جۆرێکـە لـە داوێـن پیسـی بـەناوی شـەرعەوە، بـەهیچ شـێوازێك لـە شـەریعەتی ئیسلامدا ڕێگە بەشتی وانادرێت چونکە ئەمە فرت و فێڵە بۆ خەڵەتاندنی خەڵکانی سادە،با هیچ کەسێك بیر لەم شتانە نەکاتەوە بـەڵکو پێویسـتە پیاوان ئاگایـان لـە دەم و زمـانی خۆیـان بـێ و پەلـە نەکـەن لـە بـەکار هێنـانی تەڵاقـدا وە ئەگـەر جارێـك تێکـەوتن بـا دووبـارە و سـێ بـارەی نەکەنەوە،خۆ ئەگەر کەسێك کەوتە ئـەو حاڵەتـەوە ئـەوە موسـیبەتێکەو

**هاتووە ئارام بگرە و بچۆ بۆ خۆت ژنێکی تر بێنە،نیکاحەکەت کۆتای هاتووە و خۆت و خێزانەکەت تووشی سەر شۆڕی دونیا و دواڕۆژ مەکە.**

**ئەمەی کە ووتمان پێی دەووترێت (نیکاحی تحلیل ـ مارە بەجاش) کە پێغەمبەر ﷺ نەفرەتی لێ کردووە، وەك عوقبەی کوڕی عامر لە پێغەمبەرەوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (( لَعَنَ اللّهُ الْمُحَلِّلَ ، وَالْمُحَلَّلَ لَهُ ))** الجامع الصحيح للسنن والمسانيد(٥ / ٣٤٩ ).

**واتە: خوای گەورە نەفرەتی کردووە لەو کەسەی کە ژنێك مارە دەکات بە مەبەستی حەلاڵ کردنەوەی بۆمێردی یەکەم وە نەفرەت لەو پیاوەش کە ڕازی بووە بەو کارە و دواتر ژنەکەی دەباتەوە لای خۆی، پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی لە هەر دووکیان کردووە.**

**وە هەروەها عبدالله ی کوڕی عومەر ـ خوایان لێ ڕازی بێ ـ ئەڵێت: پیاوێك هات بۆ لای ئیمامی عومەر پێی فەرموو: ئەی گەورەی ئیمانداران پیاوێك ژنەکەی تەڵاق داوە سێ جار پیاوێکی تر ئەیەوێ ژنی ئەم پیاوە مارە بکات بەڵام مەبەستی پێی ئەوەیە کە تەنها شەوێك لای بێ و پاشان تەڵاقی بداتەوە بۆ پیاوی یەکەم بۆ ئەوەی منداڵەکانی سەرگەردان نەبن و تووشی ناخۆشی و ناڕەحەتی نەبن، بەبێ ئەوەی کە پیاوی یەکەم لە گەڵ پیاوی دووهەم ڕێکەوتبێ یان کەس و کاریان ڕێککەوتبن،بەس ئەم پیاوە خۆی دێ ئەم کارە ئەنجام دەدات بۆ ئەوەی**

بۆ پیاوی یەكەم حەڵاڵ بێتەوە، ئایا ئەم كارە درووستە یان دروست نیە؟

ئیمامی عومەر فەرمووی: (( لاَ إِلاَّ نِكَاحَ رَغْبَةٍ )) فەرموو: نەخێر درووست نیە مەگەر پیاوێك بۆ خۆی ئەو ژنە مارە بكات ژنی بێ و مەبەستی جیابوونەوەی لە مێشكدا نەبێت،ئەگەر پیاوەكە مرد بە قەدەری خوای گەورە یان بەیەكەوە نەگونجان ئەوە درووستە پیاوی یەكەم مارەی بكاتەوە، پاشان ئیمامی عومەر فەرمووی: (( كُنَّا نَعُدُّ هَذَا سِفَاحًا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- )) ارواء الغليل (١٨٩٨).

واتە: ئێمە ئەم كارەمان لە زەمانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە زینا و داوێن پیسی دەزانی ،كابرایەك بێ ژنێك مارە ببڕێ بۆ شەوێك یان بۆ چەند سەعاتێك پاشان تەلاقی بدات بۆ پیاوی دووهەم.

كەواتە:ئەمەش دیسان نیكاحێكی ترە لەو نیكاحانەی كە حەرامە و دانامەزرێت وە بە هیچ شێوازێك شەریعەتی ئیسلام رێگە بەنیكاحی لەم جۆرە نادات.

# سێههم: نیکاحی موتعه

نیکاحی موتعه بریتییه: لەو نیکاحەی کە بەستراوە بە کاتێکی دیاری کراو یان نادیارەوە کە لای زۆرییەکەی بەتێپەڕ بونی چل و پێنج ڕۆژ کۆتایی دێت .........وە هیچ مارەییەك بۆ ئافرەتەکە جێگیر نابێت جگەی لەوەی کە بەمەرج گیراوە،وە هیچ نەفەقە و میراتێکیشی بەرناکەوێت و چاوەڕێی ژماردنی عیدەیش ناکات جگە لە پاك بونەوەی نەبێت وە هەر وەها نەسەبی پێ جێگیر نابێت مەگر بەمەرجیان گرتبێ وەك ئیمامی سەنعانی باسی کردووە:(( هو النِّكَاحُ الْمُؤَقَّتُ بِأَمَدٍ مَعْلُومٍ أَوْ مَجْهُولٍ، وَغَايَتُهُ إلَى خَمْسَةٍ وَأَرْبَعِينَ يَوْمًا، ............. وَحُكْمُهُ أَنْ لَا يَثْبُتَ لَهَا مَهْرٌ غَيْرُ الْمَشْرُوطِ، وَلَا تَثْبُتُ لَهَا نَفَقَةٌ وَلَا تَوَارُثُ وَلَا عِدَّةَ إلَّا الِاسْتِبْرَاءُ بِمَا ذُكِرَ، وَلَا يَثْبُتُ بِهِ نَسَبٌ إلَّا أَنْ يُشْتَرَطَ ))سبل السلام (٢/ ١٨٢).

دەبینین ئەم جۆرە نیکاحە هیچ ئامانجێکی ژن و مێردایەتی شەرعی تیادا دەستەبەر نابێت جگە لە بەکارهێنانی ئافرەتان وەك شمەكێك.

نیکاحی موتعە لە ئیسلامدا دوو جار ڕێگەی پێدراوە و پاشان بەیەکجاری حەرام کراوە هەتا ڕۆژی دوای جاری یەکەم پێش خەیبەر ڕێگەپێدراو بووە و پاشان لە غەزای خەیبەردا حەرام کرا وەك ئیمامی علی فەرموویەتی: (( نَهَى رَسُولُ اللَّهِ – صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – عَنْ الْمُتْعَةِ عَامَ خَيْبَر)) ئیمامی بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە ساڵی خەیبەردا نیكاحی موتعەی قەدەغەكرد.

دواتر لە ساڵی فەتحی مەككە و ئەوتاس ڕێگەی پێدرا و پاشان بەهەتا هەتایی حەرام كرا هەتا ڕۆژی دوای وەك ڕەبیعی كوڕی سەبرە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم دەیگێڕێتەوە كە فەرموویەتی:((إِنِّي كُنْت أَذِنْت لَكُمْ فِي الِاسْتِمْتَاعِ مِنْ النِّسَاءِ، وَإِنَّ اللَّهَ قَدْ حَرَّمَ ذَلِكَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، فَمَنْ كَانَ عِنْدَهُ مِنْهُنَّ شَيْءٌ فَلْيُخَلِّ سَبِيلَهَا، وَلَا تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا)) ئیمامی موسلیم گێڕاویەتییەوە.

واتە: من ڕوخستەم پێدان كە نیكاحی موتعە بكەن،بێگومان خوای گەورە ئەم نیكاحەی حەرام كردووە هەتا ڕۆژی دوای هەر كەسێك ئافرەتی لایە بادەستی لێ بەر بدات و ئەوەشی داوتانە پێیان هیچیان لێ وەرمەگرنەوە.

وە لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە كە سەبرەی جوهەنی فەرموویەتی: (( أَمَرَنَا رَسُولُ اللّهِ صلى الله عليه وسلم، بِالْمُتْعَةِ، عَامَ الْفَتْحِ، حِينَ دَخَلْنَا مَكّةَ، ثُمّ لَمْ نَخْرُجْ مِنْهَا حَتّى نَهَانَا عَنْهَا )) ئیمامی موسلیم گێڕاویەتییەوە.

واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ كردین نیكاحی موتعە بكەین كاتێك چووینە شاری مەككەوە لە ساڵی فەتحی مەككەدا بەڵام ئێمە هێشتا لە

شاری مەککە دەرنەچووین پێغەمبەر ﷺ نەهی لێ کردین و ئەو نیکاحەی لێی حەرام کردین.

## چەند جیاوازییەك لە نێوانی نیكاحی شەرعی و نیكاحی موتعەدا:

١/ تێپەڕبوونی کات کاریگەری دروست ناکات لەسەر نیکاحی شەرعی بەڵام نیکاحی موتعە بە تێپەڕبوونی کاتەکەی هەڵدەوەشێتەوە.

٢/ لە نیکاحی شەرعیدا بە بێ مشت و مڕ نەسەبی منداڵەکان جێگیر دەبێت، بەڵام لە نیکاحی موتعەدا نەسەب جێگیر نابێت مەگەر بەمەرجی بگرن یان داوای بکەن، لە ئەنجامدا منداڵێکی زۆر پەیدا دەبن و دەکەونە کۆڵان.

٣/ لە نیکاحی شەرعیدا بەمردنی پیاوەکە عیددەی وەفات لەسەر خێزانەکەی جێگیر دەبێت گوێزابێتییەوە یان نەیگوێزابێتەوە، بەڵام لە نیکاحی موتعەدا عیددەی وەفات واجب نابێت.

٤/ لە نیکاحی شەرعیدا ژن و پیاو میرات لەیەکتر وەردەگرن بەڵام لە نیکاحی موتعەدا میرات لەیەکتر نابەن.

٥/ لە نیکاحی شەرعیدا جیابوونەوەی ژن و پیاو بە تەڵاقدان دەچەسپێت بەڵام لە نیکاحی موتعەدا بەتەواو بوونی کاتە.

٦/ نیكاحی شەرعی بۆ دروست كردنی خانەوادە و پێكهێنانی خێزانێكی بەختەوەر و شادمان و كامەرانە،بەڵام نیكاحی موتعە دروستكردنی خانەوادە و پێكهێنانی خێزانی لێ پەیدا نابێت بەڵكو تەنها بۆ تێر كردنی شەهوەتە.

٧/ نیكاحی شەرعی هۆكاری پاراستنی داوێنە بەڵام نیكاحی موتعە هۆكاری درووست بوونی فەساد و بەدڕەوشتییە چونكە ئەو ئافرەتانە هەر چەند هەفتە جارێك لەلای پیاوێكن و ئەمەش هۆكارە بۆ نەمانی شەرم و بەئاسای وەر گرتنی كاری بەدڕەوشتی.

گەورە زانایانی ئیسلام بە پێی ئەم بەڵگانە و چەندین بەڵگەی تر یەك دەنگن لەسەر ئەوەی كە نیكاحی موتعە بە حەرام و بەتاڵ دادەنرێت و پێچەوانەی ئەو بەرژەوندی و حیكمەت و ئادابانەیە كە شەریعەتی ئیسلام پێی هاتووە بۆ درووستكردنی خێزان.

## چوارهەم: ژن هێنان بە مەبەستی تەڵاق

ژن هێنان بە نییەتی تەڵاق بریتییە: لەوەی کە پیاوێك دەیەوێت ژنێك بێنێت بۆ ماوەی ساڵێك یان کەمتر یان زیاتر و پاشان تەڵاقی بدات، هەرچەندە لە کاتی گرێ بەستی مارەکردندا ئەم مەبەستە باس ناکات و بیشارێتەوە.

ئیمامی ئەوزاعی (ڕەحمەتی خوای لە سەر بێ) فەرموویەتی: ئەم نیکاحە هەر وەکو نیکاحی موتعە وایە هیچ فەرقی نیە چونکە لە دڵیدا هەیە پاش ماوەیەك ئەو ژنە تەڵاق بدات.

ژن هێنانی شەرعی لە بنەڕەتدا ئەوەیە کەپیاو دەیەوێت خانەوادەیەك پێکەوە بنێت و ماڵێکی بەختەوەر درووست بکات،وە هەروەها ئەو ئافرەتەیش کە شوو دەکات بە نیەتی ئەوە شوو دەکات کە لای پیاوەکەی بحەوێتەوە و ڕێزی لێ بگرێت و ببێتە خاوەن ماڵ و منداڵ کەچی کابرا فێڵ و غەشی لێ بکات و پاشان تەڵاقی بدات ئایا ئەم جۆرە هەڵسوکەوتانە لە کوێی شەرعدا جێی دەبێتەوە؟!

جومهوری زانایان جیاوازیان نەکردووە لە نێوان نیکاحی موتعە و ژن هێنان بە نییەتی تەڵاق لە گەڵ ئەوەشدا غەش و خیانەت و فێڵەکەشی زیادە،و دەبێتە هۆی ڕوشاندنی سومعەی موسڵمانان و ناشیرین کردنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام.

**باشترین بەڵگەش بۆ ناشەرعی بوونی ئەم جۆرە نیكاحە ئەوەیە لە ئیمام عومەریان پرسی ئەگەر كابرایەك ژنێكی تەلأقدراو بـێنیٚ و دواتـر تـەلأقی بداتــەوە بـۆ پیاوەكـەی و هـیچ ڕیكـەوتنێكیش لـە نێوانیانـدا نـەبوبێت، فەرمووی: ئیلا دەبیٚ نیكاحی ڕەغبە بێت.**

**واتە: نابێت ئەوە لە دڵیدا بێت كە پاش ماوەیەك تەلأقی بدات بە ڵكو بـە نییەتی ئەوە بیهێنێت كە بیكاتە دایكـی منداڵـەكانی نـەك بـۆ تێركردنـی جنس و ئارەزوو وەك زۆرێك لە خەڵك ئەوە مەبەستیانە.**

**ئەمەی كە باسمان كرد چەند جۆرێك بـوون لـەو نیكاحانـەی كـە ئیسـلام نەهی لیٚ كردووە و حەرامی كردووە، بەڵام بە داخەوە هەتا ئێستا لە ناو موسڵمانانداهەر ماوە.**

**لە خوای گەورە ئەپاڕێینەوە كە لە گوناهی هـەموو لایـەكمان خۆشـبیٚ و كۆمەڵگامان پاك بكاتــەوە لـە تـاوان و فەسـاد و خراپـەكاری و قەڵـەمی عەفو بە سەر تاوانماندا بێنیٚ.**

ئەم شەو لە پێداچونەوەی ئـەم نامیلکەیـە بوومـەوە داواکـارم لـە خـوای گەورە بیکاتە مایەی خێر و خۆشی بـۆ موسـڵمانان و بـە تایبـەت بـوك و زاواکان.

و صلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى اله وصحبه اجمعين،سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك.

**محسن محمود سليمان**

**پێش نوێژ و ووتار خوێنی مزگەوتی صەلاحەدینی ئەیوبی زەڕایەن**

**(٣٠/ ڕەبیعی دووهەم / ١٤٣٩ ) ك ــ ( ١٧/ ١/ ٢٠١٨) م**

